دکتۆر عەبدولموسەوور بارزانی

# دەفتەری بیرەوەرییەکانم

دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی



**دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی هەڵۆ**


* دەفتەری بیرەوەرییەکانم

* نوسینی: دکتۆر عەبدولموسەور بارزانی

* بەرگ: بەهزاد بێخاڵی

* پیتچنین: ئارام مەولود

* نرخ: ١٥ یۆرۆ

* چاپی یەکەم: ٢٠١٨

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

* شوێنی چاپ: دەنهاخ (هۆڵەند)

# پێشەکی

چەند ساڵێک لەمەوبەر چەند هاوڕێیەک هانیان دام ئەزمونە سیاسیەکانی خۆم تۆمار بکەم. بەڵام لە راستیدا من دودڵ بووم لەو بارەوە. پێم باش بوو چاوەڕێ بکەم تا کاتی خانەنشینیم دێت بۆ ئەوەی دواتر هەندێك یاداشت بنوسمەوە کە سەراپای ژیانم بگرێتەوە، چونکە لەو باوەڕەدام هەموو مرۆڤێك لە مێژووی ژیانیدا هێندە ئەزمونی هەیە کە شایەنی باسکردن بێت.

بەڵام ئەو رواداو پێشهاتە سیاسیانەی هاوکات لەگەڵ هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان ٢٠٠٩ روویاندا، پاڵیان پێوە نام بۆ ئەوەی جارێکیتر چاو بگێڕمەوە بەم پرسەدا، چونکە نوسینەوەی ئەزمونە سیاسیەکانی خۆم بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە پارتی دیموکراتی کوردستان/ عیراق و بەتایبەتی تر لەگەڵ سەرکردایەتی ئەو حزبەدا / مەلا مستەفا/ ئیدریس/ مەسعود، ئیتر وا دەردەکەوێت کە پێویستە باس بکرێن.

لە راستیشدا پێش ئەمەش بە کورتی باسی ئەو پەیوەندییانەم کردوە لە چاوپێکەوتنێکمدا لەگەڵ گۆڤاری لڤین لە سلێمانی.

من رەخنەم لەوانە گرتوە کە خاوەن ئەزموونی سیاسین بەڵام یاداشتەکانیان تۆمار ناکەن، چونکە پێم وایە نوسینەوەی یاداشتەکان بەراستی و بێ دەستکاریکردن کۆمەکمان دەکات بۆ ئەوەی خۆمان لابدەین لەو هەڵانەی ئەوانی تر تێی کەوتون، ئەمە ئەگەر ئەو کەسانە لەوانە بن کە پەند لە خەڵکی تر وەردەگرن.

لەگەڵ گێڕانەوەی ئەم یادەوەریانە و تۆمارکردنیان، لە خوای گەورە داواکارم کۆمەکمان بکات تاکو لە راستی لانەدەین لەو شتانەدا کە لەم کتێبەدا باسی دەکەین، خودا پشتیوانمان بێت.

ئەوەی شایەنی باسە و جێگەی داخە ئەوەیە کە من ئەم رووداوانەم بە شێوەی رۆژانە نەنوسیوەتەوەو و بەرواری دیاریکراوم لانیە وەك مانگ و رۆژ، چونکە لە سەرەتاوە لەو باوەڕەدا بووم هەرچی ئەو شتانەی رودەدەن تەنیا رووداوێکی پچڕ پچڕی رۆژانەن و هیچ رایەڵەیەك پێکیانەوە گرێ نادات، تا ئەو کاتەی پێچەوانەی ئەوەم بۆ دەرکەوت و زانیم هەرچی ئەوەی توشم دەبێت زادەی هەڵوێست و پیلانێکی بۆ داڕێژراوە بە شێوەیەکی مەنهەجی، ئەوەش هانی دام یاداشتەکانم تۆمار بکەم.

من یەقینم هەیە ئەوەی کە توشم بوەو خەڵکی تریش وەك من توشیان بوە، وەك زنجیرەیەکی دژایەتیکردنن هەر لە سەرەتای ١/ ٩/ ١٩٢٧ دەست پێدەکات، لەو کاتەوە کە شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی لە کاتی نوێژکردندا تیرۆر کرا. لەو ساتەوەختەوە ئیتر لادان دەستی پێ کردوەو تا ئەمڕۆش بەردەوامە و هەموو کاروانی بارزانی گرتۆتەوە چ وەك هزر و چ وەك بیرو باوەڕ و جولانەوەی کوردیش لە کوردستانی عیراق بەگشتی، هەروەك چۆن بەشەکانی تری کوردستانیش لە کاریگەرییە سەلبیەکانی بەدەر نەبوون. چونکە بە باوەڕی من ئامانج لە تیرۆری سیاسی پێش هەمو شتێك کودەتایە. ئەو لایەنە دەیەوێت ئاراستەی جوڵەیەك بگۆڕێت یان رێڕەوێك توشی لادان بکات یان تەنانەت لە ناویشی بەرێت ئەگەر بتوانێت. مەبەست لە تیرۆرکردنی عەلی کوڕی ئەبوتالیب رەزای خوای لێبێت چی بوو؟ یان تیرۆر کردنی یۆلیۆس سیزار، یان تیرۆری جۆن کیندی...هتد؟

تیرۆرکردنی هزرە لە رێگەی تیرۆری کەسەکانەوە وهیچی تر؟

عەبدولموسەور بارزانی

دهۆك

## پاش بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠

پاش ئەوەی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش دەرچوو لە دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ ئازار ١٩٧٠، کە بڕیاری دابوو ئەفسەر و فەرمانبەر و کارمەندەکانی کورد کە لە باشور کاریان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ ناوچە کوردنشینەکان و دوای ئەوەی راپەڕاندنی ئەم بڕیارە دواخرا، هەندێك لە ئەفسەرانی کورد پێشنیاری ئەوەیان کرد کە من سەردانی بەغداد بکەم و داوا لە بەرپرسانی کورد بکەم بەدوادا چوون بۆ ئەو پرسە بکەن و هانیان بدەم داوای جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە بکەن.

لە بەغدا پەیوەندیم کرد بە سامی عەبدولرەحمان، کە لەوکاتەدا پۆستی وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکوری بەدەست بوو، کێشەکەم لای ئەو باسکرد، بەڵام دیاربو ئەو دودڵ بوو لەوەی ئەو بابەتە لای وەزیری ناوخۆ باس بکات.

هەرچەند هەوڵم دا تێی بگەیەنم کە ئەوە بڕیارێکە و هێزی یاسایی هەیە و دەبێت شتێکی لەو شێوەیە زۆر ئاسان بێت لە نێوان وەزیرەکاندا کە هەمویان هاوڕێی یەکترن. بەڵام سامی سور بوو لەسەر ئەوەی کە تەنها بابەتەکە لەگەڵ بەڕێز عەبدولمەجید خەیات بکاتەوە، کە ئەویش بەرپرسی کارگێڕی کاروباری ئەفسەرانی پۆلیس بوو، واتە راستەوخۆ بەرپرس نەبوو لە راپەڕاندنی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش.

بەهەر حاڵ دواجار بڕیارەکە جێبەجێ کرا، هەرچەند زۆریش دواکەوت، لەوێوە ئیتر بەریەککەوتن لەگەڵ بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەستی پێکرد، چونکە پاڵپشت بە بەیاننامەی ۱۱ ئازار دەبوو پارێزگار و بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بن.

جێی ئاماژە بۆ کردنە، من لە ژیانمدا سەر بەهیچ پارتێکی سیاسی نەبووم. بەڵام ئەمەش مانای وانیە کە هیچ هەڵوێستێك یان مەیلێکی سیاسیم نەبوبێت لە ئاست روداوەکاندا، بەڵکو تەنانەت لە کاتێکدا قوتابی بووم لە ناوەندی و ئامادەیی هەموو تێڕوانینەکانم ئاڕاستەی سیاسیان هەبووە، چونکە ژیان لەژێر هەلومەرجێکی تایبەتدا بە درێژایی کات، ناچاری کردووین هەمیشە لە ڕوداو وپێشهاتەکان رابمێنین، بەتایبەتی ئەو پێشهاتانەی نزیکی خۆمانن کە بێگومان بە زۆری هەمویان پێشهاتی سیاسی بوون. کەواتە هەر دەبوو لەژێر کاریگەری ئەو روداوانەدا بین بە هەر شێوەیەك بێت. ئەم حاڵەتە تەنانەت لە خوێندنگەی سەرەتاییشدا رەنگی داوەتەوە چونکە دەبینین خوێندکاران هەمیشە حەز بە نیگارکێشانی ئەو فڕۆکانە دەکەن کە گوند و شارەکانیان بۆردومان دەکەن، چونکە ئەو روداوانە بەشێك لە یادەوەری منداڵیی ئەوان پێکدێنێت.

لەو سەروبەندەدا عەبدولوەهاب ئەتروشی پارێزگاری هەولێربوو، شێخ رەزاش کە خەڵکی سلێمانی بوو، بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر بوو، بە راشکاویش دەڵێم مامەڵەکردن لەگەڵ بەڕێوەبەری پۆلیسدا ئاسانتر بوو چونکە پیاوێکی بێ هەوا بوو و کراوەتریش بوو.

بۆ ماوەی ساڵێك گوازرامەوە بۆ شارەدێی بارزان، وا رێککەوت لەو ماوەیەدا پەیوەندیەکانی نێوان شێخ عوسمان و مەلا مستەفا/ سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، زۆر خراپ بوو.

لە راستیدا من تا ئێستاش پاشخانی ئەو ناکۆکیە نازانم بۆیە ناچمە ناو ئەو بابەتەوە و تەنیا باسی ئەوە دەکەم کە بینیومە.

رۆژێکیان عەبدولباری شێخ سلێمان پەیوەندیی پێوەکردم و گوتی: خاڵم (خاڵی عەبدولباری) دەیەوێت لە هاوینە هەواری کۆزی قسەم لەگەڵدا بکات. کاتێك گەیشتمە ئەوێ شێخ عوسمانیش ئامادەبوو و قسەکان بە رەخنە گرتن لە هەڵسوکەوتەکانی مەلا مستەفا دەستی پێکرد، لەبەر ئەوەی پشتگیری

ئاغاکانی زێبار دەکات، ئەو گوتی زۆر کۆسپی دێتە رێ و مەسعودی تاوانبار کرد بەوەی ئەو هەموو پیلانەکان لە دژی ئەم دەیگێڕێت، و هەر ئەویش هۆی هەموو ناکۆکیەکانە...هتد.

لێرەدا دەبێت هەندێك روونکردنەوە بدەم لەسەر دەستەواژەی (شێخ) کە خەریکە دەلکێنرێت بە ناوی هەموو کەسێکەوە بەتایبەتی لەم دواییانەدا و بەناهەق و بە شێوەیەکی هەڕەمەکی، ئەوەش مانای وانیە کە ئەو کەسەی نازناوی شێخی پێوەیە هەر بەڕاستی شێخێك بێت لە شێخەکانی بارزان.

چونکە ئەم پێگەیە هەندێك مەرجی تایبەت بە خۆی هەیە دەبێت لەو کەسەدا هەبێت، هەبوونی ئەو مەرجانەش لە کەسێکدا گەلێك گرانە، یەکێك لەو مەرجانە ئەوەیە کە دەبێت ئەو کەسەی دەبێتە شێخ لە لایەن شێخی پێشوەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا وەك شێخی بارزان دەستنیشان بکرێت و دوای مردنی شێخی پێشوو ئینجا ئەو دەبێتە شێخ، ئینجا خەڵکی ناوچەی بارزان و ئەوانەی موریدیانن دێن و بەیعەت دەدەت بەو شێخە. سەبارەت بەوەی ئێستا دەبینین هەر کەسێك نازناوی شێخ بە خۆیەوە دەنێت، ئەوە ستەمێکە دژ بە مێژووی بارزان و کەلتوورەکەیان دەکرێت لێرەدا دەبێت باسی ئەوەش بکەین کە هەندێك ناو داڕێژراون، واتە لەگەڵ نازناوی شێخدا کارێکی تریشیان هەیە و ناوێکی تریان بۆ زیاد دەکرێت، وێڕای ئەوەش دوا شێخەکانی بارزان شەهیدکراوە بێ ئەوە جێنشینێك لە دوای خۆی دەستنیشان بکات. واتە شێخ خورشید بارزانی. ئەوەش واتە کۆتایی هاتن بە زنجیرەی شێخانی بارزان.

من لە لای خۆمەوە بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی کەم لە بارزاندا ژیاوم و تەنها لە کاتی پشووی هاوینەدا لەوێ ئامادەبووم بۆیە دەشێت زانیاریەکانی من لە زانیاری کەسانی تر کەمتر بن لە هەندێك لایەنەوە، بۆیە هەوڵم دا ئەوە بیری شێخ عوسمان بێنمەوە کە زۆرینەی هەرە زۆری بارزانیەکان تەواو دەترسان لەو پەیوەندییانەی هەیەتی لەگەڵ ئەو کەسانەی ئێستا خۆی رەخنەیان لێ دەگرێت. بەڵام هەڵوێستی تۆ لەگەڵ ئەوان– مەلا مستەفا– پێچەوانە بوو بەڵکوو تایبەتیش بوو، پەیوەندیەکی توند و تۆڵت هەبوو لەگەڵیان، هەروەها فشارت دەخستە سەر خەڵکیتریش بۆ ئەوەی هەمان هەڵوێستی تۆیان هەبێت. بۆیە زۆرینەی ئەوانەی سەر بەو خێزانەن لەسەر هەڵوێستی یەکەمتان پشتیوانی لەوان دەکەن، بەڵام ئەوەتا ئێستا ئاڕاستەکەتان دەگۆڕن. ئەمە بۆچی؟

هەروەها پێم گوت: ئەو هەڵوێست گۆڕینە دەبێتە بەربەستێك لە نێوان ئێوە و خەڵكدا و ناتوانن لە روداوەكان تێبگەن، بەراستیش پێتان دەڵێم باوەڕناكەم خەڵك بەئاسانی بەدەم ئەو هەڵوێست گۆڕینەتەوە بێن. من بە راشكاوی رای خۆم بە شێخ گوت بۆ ئەوەی ئەویش رەچاوی رایەكەم بكات. بەڵام ئەو توڕە بوو بەتوندی بە عەبدولباری گوت: هەڵسە خاڵە بابڕۆین ئەم پیاوەش هەر وەك ئەو خەڵكانەیترە كە قسەكردن لەگەڵیان قورسە، پاشان جێگەكەیان جێهێشت و منیان بە تەنیا لە میوانخانەكە جێهێشت!

دوای ئەمە رەوشەكە بە تەواوەتی قەیراناوی بوو، خەڵك پێیانزانی (بە ڕای خۆم) سیاسەتی شێخ عوسمان زۆر سادە بوو كاتێك ململانێی لەگەڵ مەلا مستەفا دەكرد. ئەو دەیزانی و خەڵكیتریش دەیانزانی كە هێزی مەلا مستەفا لەو كاتەدا لە ئێرانەوە دێت كە لە رووی مادی و سەربازییەوە پشتیوانی دەكرد، بۆیە دروستكردنی جۆرێك لە هاوسەنگی لە تەرازوی هێزدا پێویستی بەوە بوو كە شێخ عوسمانیش لە لایەنێكەوە پشتیوانی بكرێت، بۆیە شێخ عوسمان عیراقی هەڵبژارد بۆ ئەو مەبەستە، تەنانەت هەوڵیشیدا بۆ ئەوەی هێزی سەربازیی عیراق پەلكێش بكات بۆ ناوچەی بارزان بەڵام پیلانەكەی شكستی هێنا.

لە راستیدا من خۆم لەو كەسانە بووم كە پێم وابوو هێنانەوەی هێزەكانی بەعس بۆ ناوچەی بارزان كارێكی دور لە ئەقڵ و حیكمەتە، بەتایبەتی گەر بزانین ناوچەی بارزان هەر لەسەرەتای بزوتنەوەی كوردەوە زۆربەی كات هێزی عەسكەری تێدانەبووە. بەو شێوەیەش خەڵك بیریان دەكردەوە، ئەمەش وایكرد شێخ عوسمان زیاتر كەنارگیر بێت، ئەویش بە هۆی سیاسەتێكی ژیرانەوە كە مەلا مستەفا دژی شێخ عوسمان گرتبویە بەر، لەمەشدا سودی لە هەڵەكانی شێخ عوسمان دەبینی. بە هۆی قوڵبوونەوەی قەیرانەكانی نێوان مەلا مستەفا و شێخ عوسمان نێردراوی حكومەتی عیراقی (مورتەزا ئەلحەدیسی) هات بۆ بارزان، بە یاوەریی هەندێك لە بەرپرسانی كورد لە بەغدا، لە نێوانیشیاندا وەزیری كشتوكاڵ (نافیز جەلال) هەبوو كە كورد بوو، ئەوان بە هێلیكۆپتەرێك گەیشتنە ناوچەكە، بەهۆی قەیرانی پەیوەندییەكانی نێوان حكومەتی عیراقی و بزوتنەوەی كوردی، كە ئەویش بە هۆی قەیرانی پەیوەندییەكانی نێوان شێخ عوسمان و مەلا مستەفاوە بوو. منیش وەك بەڕێوەبەری پۆلیسی ناوچەكە چووم بۆ پێشوازیكرن لە شاندەكە. هەر كە وەزیری دەرەوە لە فڕۆكەكە

دابەزی پێی گوتم: مولازم عەبد تکاتان لێ دەکەم مەیکەنە مەسەلەیەکی عەشایەری و خۆتان ماندو مەکەن بە ئامادەکردنی خواردنی قەشەنگەوە، بەخوا من زۆرم برسییە بۆیە خواردنێکی سادە بەسە، بەڵام بە خێرایی ئامادەی بکەن.

منیش بێگومان ئەمەم بەماڵی شێخ عوسمانم گوت بەڵام ئەوان گوتیان هەردەبێت جۆرێك بە رێزەوە خواردنیان بۆ ئامادە بکەین، ئەی ئەگەر ئەوان سبەینێ رۆیشتنەوە چیمان لە بارەوە دەڵێن؟

کاتێك بەرەو ماڵی شێخ عوسمان دەڕۆیشتین مشتومڕ لە نێوان هەردوولایەندا بەردەوام بو. کوردەکان وەك دەردەکەوت دەیانویست رەوشەکە هێور بکەنەوە بەڵام وەزیری دەرەوە دەیویست تا دوا رادە سوود لەو رەوشە ببینێت، تەنانەت سەرزەنشتی وەزیری کشتوکاڵی کرد و پێی وت: تۆ چیت، وەزیری پیازیت!

دیسان لێرەشدا نا یەکسانی لە نێوان وەزیرە کوردەکان و وەزیرە عەرەبەکاندا دەرکەوت!

دواتر یەکێك لە بارزانیەکان بۆی گێڕامەوە کاتێك شێخ محەمەد خالید بارزانی سەردانی وەزیری ناوخۆی عێراقی کردوە لە سەر داوای وەزیر خۆی، سامی عەبدولڕەحمان کە وەزیر بوو یاوەریی شێخ محەمەد خالیدی دەکرد، بەڵام سامی هەر لە بەردەرگاکە مایەوە، لە کاتێکیشدا وەزیری ناوخۆ بە گەرمی داوای لە شێخ خالید دەکرد کە لێی نزیك بێتەوە بۆ ئەوەی قسەکردنیان ئاسان بێت کەچی سامی، وەزیرە کوردەکە کە لای دەرگاکەوە وەستابوو بەهەمان گەرمی داوای لە شێخ خالید بارزانی دەکرد کە وەزیری ناوخۆ زیاد لە پێویست هەراسان نەکات.

لەو گفتوگۆیەدا کە لەماڵی شێخ عوسمان بەرێوەچوو، دەرکەوت کە وەزیری دەرەوە زۆر زاڵە بەسەر وەزعەکەدا و تا دوا رادەش سودی لە هەڵوێستی شێخ عوسمان بینیبوو کە داوای دەکرد عێراق بیپارێزێت. بە پێی هەڵسەنگاندنی خۆم وەزیری دەرەوە نەیهێشت دو لایەنەکە بگەنە هیچ لێك نزیکبوونەوەیەك بەڵکوو هەوڵی باشی دا ناکۆکیەکان قوڵتر بکاتەوە.

هێواش هێواش پێگەی شێخ عوسمان دادەبەزی و خەڵکی لێی دەتەکینەوە، لە راستیدا من لەو کەسە دەگمەنانە بووم لە بارزانیەکان کە سەردانم دەکرد، هەرچەند لەمەوبەر سەردانم نەدەکرد.

تاکه هۆیەکیش پاڵی پێوە دەنام سەردانی بکەم هەر ئەوە بوو کە شێخ عوسمان کوڕی کۆچکردوو شێخ ئەحمەد بارزانی بوو هیچیتر.

پاش ماوەیەك فەرمان دەرچوو بە گواستنەوەم بۆ هەولێر، لەوێندەر بیستم کە لە نێوان هەردوولا گەڕێکی تری یەکلاکەرەوە بەڕێوە چوە، پاش ئەوەی هەڵسوکەوتەکانی شێخ عوسمان زیاتر توشی کەنارگیری کردبوو. بەتایبەتی پاش ئەوەی کە لەگەڵ براگەورەکەشیدا (شێخ محەمەد خالید بارزانی) تێکی دابوو، ئەوەش وەهای کرد دواجار جۆرێك لە ململانێ لە نێوان براکاندا رویدات، ئەم ناکۆکیە درێژەی کێشا و خەریکبوو سەر بکێشێت بۆ ناکۆکی چەکداری لە نێوان هەردولادا لەسەر هەردوو کەناری چەمی روکوچك کە دەڕژێتە نێو زێی گەورەوە نزیك گوندی بارزان. لەو سەروبەندەدا لەسەر لای خۆرهەڵاتی روبارەکە چەکدارانی سەر بە شێخ محەمەد خالید کە لە نێویاندا خوارزاکەی عەبدول موهەیمین هەبوو کۆبوونەوە، لە کاتێکدا لە بەری خۆرئاوای روبارەکە چەکدارانی سەر بە شێخ عوسمان کۆ ببونەوە و خوارزاکە (عەبدولباری) پشتیوانی دەکرد، هەندێك جنێو و قسەی ناشیرینیش گۆترابوو بە یەکتر، هەرچەندە هەندێك کەس دەیانویست ئاگری ئاژاوەکە خۆش بکەن، بەڵام هیچ لایەك فیشەکی نەنا بە لایەنەکەیترەوە، بەوەش خودا بارزانییەکانی پاراست لەوە خوێنی یەکتری بڕێژن.

لە سەردانێکی کورتم بۆ ناوچەی بارزان بەرێکەوت کۆمەڵێکم لە بارزانییەکان بینی کە لەماڵی شێخ بابۆ لە رێزان کۆببونەوە، ئەو پیاوێك بوو دژی هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕ بوو. لە راستیدا زۆرینەی بارزانییەکانیش لەو رووداوەی سەر رووباری رووکوچك تووشی شۆك ببوون. ئێستاش قسەکانی شێخ خورشید– کە دوا شێخی بارزان بوو– لە گوێمدا دەزرنگێتەوە، دەیگوت: (ئێمە دەزانین چۆن جەنگ بەڕێوەبەرین بەڵام بەشداری لە جەنگی وادا ناکەین) ئینجا سەیری منی کردو پرسی (عەبدولمسەور، تۆ بۆچی لەم بارەوە شتێك ناڵێت؟) من گوتم: نازانم لە رەوشێکی وەهادا پێویستە چی بوترێت. من توشی شۆك ببوم، ئەبلەق ببوم، هەروەك زۆرینەی بارزانییان لە خۆمم دەپرسی: چۆن رەوشەکە گەیشتۆتە ئەو رادەیەی شێتی و داخزان؟

لێرەوە دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە شێخ خورشید شوێنکەوتەکانی خۆی راسپاردبوو بە هیچ شێوەیەك بەشداری لە هیچ ململانێیەکی ناوخۆیی

چەکداری نەکەن چونکە بارزان ئەرکی ئەوەیە کە رێگە لە ئاژاوەی ناوخۆیی بگرێت نەك بیوروژێنێت، وێڕای ئەوەش بارزانییەکی ناوچەی شێروان ساڵی ٢٠٠٦ پێیگوتم کە ساکۆ کانیەلنجی رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە راگرتنی شەڕ، گوتی لەو کاتەدا بە درێژایی روبارەکە رایدەکردو هاواری دەکرد: (هەمووتان بارزانین نەکەن تەقە لە یەکتر بکەن. لە بیرتان نەچێت هەمووتان بارزانین).

پێدەچێت شێخ عوسمان بۆ ئەوەی دوا هەوڵی خۆی بدات بۆ رازیکردنی محەمەد خالیدی برای، تاکوو لە مەلا مستەفا دور بکەوێتەوە، چووە بۆ مێرگە سۆر و لەوێندەر بۆ یەکەمجار دانی بە هەندێك راستیدا ناوە کە بارزانییەکانی بۆ ماوەی چەندین ساڵ توشی سەراسیمەیی کردبوو، کاتێك لە ماڵی براکەی لە مێرگەسۆر هەندێك راستیی وتبوو : (هەموو شوێنکەوتەکانی باوکم لە ژێر داردا تێکشاند بۆ رازیکردنی مەلا مستەفا بەڵام سەرکەوتوو نەبووم، دەبێت تۆ سود لەم ئەزموونەی من وەربگریت).

لێرەدا راستیەك دەرکەوت کە تا ئەو کاتەش شاراوە بوو یان بە تەم و تومان داپۆشرابوو بۆ ماوەیەکی درێژ، چونکە زۆر لە شوێنکەوتەکانی شێخ ئەحمەدی بارزانی توشی لێدان و فەلاقەکردن ببون بە فەرمانی شێخ عوسمان، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو و دووکەسیش لەو بارەوە کوژرابوون، خەڵك دەیانپرسی لە بارەی ئەو پاڵنەرانەی وەهای لە شێخ عوسمان دەکرد کە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ شوێنکەوتەکانی باوکیدا بکات و نەیاندەتوانی وەڵامێکی ماقوڵ و منتیقییان دەستبکەوێت، تا ئەو ساتەوەختەی شێخ عوسمان دانی بەوەدا نا کە ئامانجی تەنیا ئەوە بوە مەلا مستەفا رازی بکات!

هەروەها نامەیەکی پیشانی بارزانییەکان دا و گوتی (مەلا مستەفا داوای لێکردووم ئەو کارە بکەم).

لە کۆتاییدا و بە هۆی ئەو رێگرییانەی لێی دەکراو وێڕای هەڵسوکەوتەکانی شێخ عوسمان خۆی کە هەموو دەرگایەکی لەبەردەم خەڵکدا داخستبوو تا لە هەڵوێستەکانی تێبگەن و ئامانجەکانی بزانن، زیاتر و زیاتر توشی کەنارگیری بوو ئیدی خۆی لە حاڵێکدا دەبینیەوە کە کەس خۆزگەی پێ نەخوازێت بۆیە بڕیاریدا ناوچەی بارزان بەجێ بێڵێت و روو بکاتە بەغداد و شاخی پیرسی بە ئاراستەی گوندی باڵندەدا بڕی، چونکە رێگەکانی تر لەژێر چاودێری دابوون. خەڵکێکی کەمیش لەگەڵیدا بون کە زۆربەیان خزمەتکارەکانی خۆی بوون، لەگەڵیدا رۆیشتن، هەروەها شێخ نەزیری براشی لەگەڵیدا رۆیشت.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسی ئەوە بکەم کە عوبەیدوڵای بارزانی پێش شێخ عوسمان رووی کردبوە بەغدا، لەبەر ئەوەی لە ناوچەی حاجی ئۆمەران روبەڕووی تەنگپێهەڵچنین ببۆوە، بەڵام لە ڕاستیدا من لەو بارەوە زانیاریەکی وام لانیە شایەنی باس بێت بۆیە پێم باشە هەر باسی نەکەم.

سەبارەت بە عوبەیدوڵا بارزانی دەتوانم باسی بکەم ئەوەیە کە پەیوەندیم لە گەڵیدا باش بوو، ئەو هاوکاری زۆری کردم لە بەغداد کاتێك چوومە ئەوێ بۆ خوێندن. بەڵکو هەوڵی باشیدا بۆ ئەوەی چانسێکم بۆ بدۆزێتەوە بۆ رۆیشتن بۆ ئەمریکا بەڵام سەرکەوتو نەبوو لەوەیاندا بە کورتی مامەڵەکردنی لەگەڵمدا بە شێوەیەك باش بوو کە ناتوانم بە هیچ شێوەیەك بەراوردی بکەم لەگەڵ هەڵسوکەوتەکانی ئیدریس و مەسعود، عوبەیدوڵڵا بارزانی لە بەغدا بە زۆر هاوڕێ و ناسیاوی خۆی پێ ناساندم هەر لە وەزیرەوە تا دەگاتە بەرێوەبەری گشتی و باڵوێز و چەندین کەسی تر، هەمو جارێکیش جەختی لەوە دەکردەوە و دەیگوت: عەبدولمسەور تاکوو بازنەی ناسینەکانت زیاتر بن توانای بەرەنگاربوونەوەی سەختییەکانت بۆ دۆزینەوەی چارەسەر زۆرتر دەبێت.

لە راستیدا عوبەیدوڵا یارمەتی من و خەلکانی تریشی لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بێ جیاوازی دەدا، ئێستاش بیرم دێت کاتێك سوپاسم کرد بۆ ئەو هاوکارییانەی پێشکەشی کردوم گوتی: سەبارەت بە ئەمریکا جێگەی داخە نەمتوانی کارت بۆ بکەم، بەلام وەك سەرەتا بەغدادیش خراپ نیە، دوای هەندێك تێڕامان گوتی: شتێك هەیە گەر دەتەوێت پیاوەتیم لەگەڵ بکەیت، هەر کاتێك فەرمانی دەستگیر کردنم دەرچوو دەبێت پێنج خولەك پێش بەجێهێنانی فەرمانەکە ئاگادارم بکەیتەوە بۆ ئەوەی بتوانم بە دیواری دراوسێیەکدا هەڵزنێم و هەڵێم.

لێرەدا بە باشی دەزانم بڵێم براکەی تریشی (لوقمان) پاش هەرەسهێنانی بزوتنەوەی کوردی هاتە پاڵ عوبەیدوڵا لەبەر ئەوە ئەویش لە نەغەدە تەنگی پێ هەڵچنرابوو. هەرچەند ئەم تێبینییە بازدان بوو بەسەر زنجیرەی کاتدا بەڵام ئیدی ئێستا ئەوەم بیرکەوتەوە.

## پێشهاتەکانی ساڵی ١٩٧٤

بەیاننامەی یانزەی ئازار دەبوو لە ماوەی چوار ساڵدا جێبەجێ بکرێت. بەڵام هەر ساڵێك تێدەپەڕی بەڵگەی زیاتر کەڵەکە دەبوون لەسەر ئەوەی حکومەتی عیراقی نایەوێت ئەو بەیاننامەیە جێبەجێ بکات لە راستیدا حکومەتی عیراقی ئەو ماوەیەی قۆستەوە بۆ خۆ سازدان بۆ گەڕێکی تری سەربازی و رەخساندنی هەل و مەرجێکی لەباری سیاسی بۆ عیراق، لەمەشدا زۆر بە باشی سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

سەبارەت بە خۆم وەك ئەفسەری پۆلیس لە هەولێر دەستبەکار بووم. لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ و سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ هەندێك نامەم لە ئیدریس و مەسعودەوە پێدەگەیشت. ئەوان داوای ئەوەیان دەکرد کە بچمە ناو بزوتنەوەی کوردەوە، ئاماژەشیان بەوە دەدا کە وا باشترە چ وەك ئەفسەر و چ وەك یاساناس سود لە تواناکانم وەربگرن. بە راشکاوی دەیڵێم هەر لە سەرەتاوە دودڵ بووم لەوەی بدەمە پاڵ بزوتنەوەکە، چونکە پێش هەموو شتێك من بە نیاز بووم بەردەوامی بە خوێندنەکەم بدەم، هەر بۆیە بڕوانامەکەم وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی و روسی وێڕای زمانی عەرەبیش، لەمەشدا ئەوەم لەبەرچاو گرتبوو کە ئەگەری ئەوە هەیە لە میسر یان ئەورووپا یان وڵاتێکی سۆسیالیستی بەردەوامی بە خوێندن بدەم.

لە لایەنی سیاسیشەوە هەندێك مەترسیم هەبوو چونکە دەمبیست کە سیاسەتەکانی مەلا مستەفا هەندێك جار بە دڵی شێخ ئەحمەدی بارزانی نین، ئەمە بێجگە لەوەی هەڵسەنگاندنەکانی کوڕانی مەلا مستەفا بۆ رەوشەکە بە هیچ شێوەیەك واقیعی نەبوون، ئەوەش ساردتری دەکردمەوە لە کاتی گفتوگۆیەکدا لە ڕێزان لەگەڵ مەسعود کە لەماڵی لوقمانی برای بەڕێوە چوو،

ویستم ئەوەی تێ بگەیەنم کە من بۆ ماوەیەك لە کەرکوك کاربەدەست بووم، ئەوەی لە وێندەر دیومە نیشانەیەکی مەترسیدارە، ئەویش بە هۆی سیاسەتی تەعریبەوە کە دەسەلاتی عیراقی ماوەی چەندین ساڵ بوو پەیڕەوی دەکرد بەتایبەتی دوای هاتنە سەر کاری حزبی بەعس. بەلام مەسعود ئامادە نەبوو گوێ لە دەنگی حیکمەت و واقیعیبوون بگرێت، کاردانەوەی مەسعود تەواو کاردانەوەیەکی عاتیفی بوو و ئەقڵی تێدا بزر بوو، بەڵکوو هیچ ئامادەیی تێدا نەبوو کە ئەو بابەتە باس بکات بە شێوەیەکی بابەتی، لێرەوە تێگەیشتم کە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەمانە ئاسان نیە.

هەروەها دیدارێك لەگەڵ ئیدریس هەبوو، ئەو بەراشکاوی پێی گوتم کە ئەو گۆڤار و رۆژنامە و بلاوکراوانە ناخوێنێتەوە کە حزبەکان دەریدەکەن چونکە بە زۆری خەریکی ئەو نامانە دەبێت کە پێی دەگەن. ویستم تێی بگەیەنم کە رۆژنامە و بلاوکراوەی حزبەکان گرنگن، چونکە گوزارشت لە هەڵوێستی ئەو حزبانە دەکەن و هەوڵ دەدەن لەوێوە پشتیوانی جەماوەری بۆ خۆیان بەدەست بێنن، بێگومان تاکوو توانای مادیشیان زیاتر بێت ئەو حزبانە هەوڵ دەدەن دەزگای راگەیاندنی باشتر بەدەست بێنن، وەك رادیۆ و تەلەفزیۆن، بەلام حزبە کەم دەرامەتەکان هەوڵ دەدەن لەڕێی بلاوکراوەوە خۆیان بناسێنن بە جەماوەر چونکە ئەوە تاکە ئامڕازە بە دەستیانەوە، بۆیە پێویستە گوشە نیگای ئەوانیش بزانرێت و بتوانرێت بە رای بەرامبەر وەلامیان بدرێتەوە.

هەرچەند لەوێدا هەستم کرد دژ بە بۆچوونەکانی من بوو، بەلام لە دیداری دواتردا هەستم کرد کە بلاو کراوەکان دەخوێنێتەوە!

بە نزیکبوونەوەی کاتی یەکلاکەرەوەی بەیاننامەی یانزەی ئازار ١٩٧٤، ئەو بارزانییانەی لە هەولێر نیشتەجێ بوون پێیان راگەیانم کە شێخ محەمەد خالید فەرمانیکردەوە هەموویان بگەڕێنەوە بۆ لای من هەر شتێکیان هەبوو، بەمەش من بوومە بەرپرسی کاروباری ئەوان لە هەولێر.

بەلام لە هەمان کاتیشدا زیاتر فشارم دەخرایە سەر بۆ ئەوەی بچمە نێو ریزەکانی بزوتنەوەی کوردایەتیەوە، دوا فشاریش گەیشتنی نێردراوێك بوو لەلایەن شێخ سلێمان بارزانیەوە کە ئەم هەواڵەی پێگەیاندم: دەبێت بێیتە ناو بزوتنەوەکە ئەگەر نا هەمو زیان دەکەن

کەواتە ناچارین دەبێت هەر بدەینە پاڵ بزوتنەوە. بە ڕاشکاوی دەڵێم تێنەگەیشتم ئەم وشانە واتای چی دەگەیەنێت، تەنها دوای چەند ساڵێك تێگەیشتم، دوای ئەوەی بە چەند ئەزمونێکدا تێپەڕیم کە زۆربەیان تەواو نەرێنی (نێگەتیڤ) بوون، تێگەیشتم ئەگەر بە گوێیان نەکەیت ئەوە هەموو خێزانەکەت دوچاری سزادانی بەکۆمەڵ دەبنەوە. دەشێت تەنانەت ڕووبەڕووی هەژاری و نەداریش ببنەوەو توشی ناڕەحەتی وایان دەکەیت کە سەرو بنی نیە.

جا ئەگەر هەر دەبێت بدەمە پاڵ شۆڕش ئەوە وا باشترە ڕاستەوخۆ ڕووبکەمە دیلمان، ئەو شوێنەی کە سەرۆکی بزوتنەوەکەی لێیە. لە ڕاستیدا ئەمەش یەکەم دیدار بوو لەگەڵیدا بە تەنیا کۆببمەوە. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو، ئاماژەی بەوە کرد کە دەشێت بمنێرێت بۆ دەرەوەی وڵات تاکوو خوێندنەکەم تەواو بکەم. بێگومان یەکسەر هەستم کرد کە دکتۆر هەر خۆی هاوکاری کردم بۆ ئەوەی بڕوانامەکەم وەربگێڕم.

دوای ئەوە چاوم کەوت بە ئیدریس و مەسعود و بابەتەکەم بۆ باسکردن، ئیدریس لەم بارەیەوە گوتی: کەواتە گەیشتویتە ئەوێش.

بە ڕاشکاوی دەڵێم سەبارەت بە من ئەوە بڕگەیەکی گرنگ بوو، بۆیە بڕیارمدا بچمە ناو ریزەکانی بزوتنەوەکەوە.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی وادەی کۆتایی چوار ساڵەکە چوومە ناو ریزەکانی بزوتنەوەی کوردایەتیەوە، لە کاتی ڕۆیشتنماندا وێڕای ئەوەی بە چەندین خاڵی پشکنیندا تێپەڕین، بەڵام توشی هیچ ناڕەحەتییەك نەهاتین، ئەوەش ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە ڕێنماییان پێ گەیشتوە ڕێگری نەکەن لەوانەی دەچنە ناو بزوتنەوەکە لە ڕووی ئابورییەوە گران، بکات یان بۆ ئەوە بێت کە باری خۆی سوك بکات لە هەوادارانی شۆڕش لە شارەکاندا.

کاتێك پەیوەندیم بە بزوتنەوەی کوردیەوە کرد، داوام لە هاوڕێ و ناسیاوەکانم نەکرد وەك من بکەن، بە دووریشی نازانم کە ئەم هەڵوێستەی من هەندێکیانی توشی بێ ئومێدی کردبێت.

بەڵام هۆی راستەقینەی ئەو هەڵوێستەم گومانم بوو لەو بەڵێنە گەورانەی کە بەو خەڵکە درابوون، من نەمویست ئەو بەرپرسیارێتیە هەڵبگرم و لە شتێکیانەوە بگلێنم کە نازانم ئەنجامەکەی چۆن دەبێت.

سەبارەت بەو بارزانیانەی لە هەولێر بوون ناچار بووم بە راشکاوی قسەیان لەگەڵ بکەم، ئەویش بە هۆی ئەو فەرمانەوە بوو کە شێخ محەمەد خالید دەری کردبوو، بەهەر حاڵ منیش نەمدەتوانی ئەو فەرمانە فەرامۆش بکەم، بۆیە داوام لێکردن لە ماڵێکدا کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی لەو بارەوە گفتوگۆ بکەین. لەوێدا من سەرپشکم کردن لە نێوان مانەوە یان چونە ناو بزوتنەوەکە و تێم گەیاندن من بە هەر حاڵ دەچمە ناو بزوتنەوەکەوە. لەوێدا باسی شێوازی رەفتارەکانی ساڵی ١٩٦٣ ی حزبی بەعسم بۆ کردن و تکام لێکردن کە ئەو خاڵە لەبەر چاو بگرن.

## بزوتنەوەی کوردایەتی ١٩٧٤- ١٩٧٥

پاش ئەوەی چومە ناو بزوتنەوەی کوردەوە، هەزاران کەسی تر لە خەڵکی شارەکانیش هەر لە ئەفسەرەوە بۆ پزیشك و مامۆستایانی زانکۆ و خوێندکاران ...هتد، هاتنە دەرەوە. ئەوەش وەك گوزارشت بوو بۆ پشتیوانیکردنیان لە بزوتنەوەکە، ئەو دەرچوونە بە رادەیەك بوو کە ژمارەی خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆ گەیشتبوە ئاستێك تەنانەت بیر لەوە دەکرایەوە یەکەم زانکۆی کوردی لە ناوچە ئازاد کراوەکاندا دابمەزرێت (قەڵادزە)، ئەویش دواجار بۆمباران کرا و ژمارەیەکی زۆر کوژراو و بریندار ی خەڵکی سیڤیل و بێ چەکی لێکەوتەوە و بیرۆکەی بنیاتنانی زانکۆی لە گۆڕ نا.

پاش ئەوەی چومە ناو بزوتنەوەکەوە سەردانی هەردوو برا "ئیدریس و مەسعود"م کرد و پێم راگەیاندن کە ئامادەم بۆ خزمەت، بەڵام ئەوان پێیان راگەیاندم کە پێویستیان بە خزمەتی من نیە و وا باشترە بگەڕێمەوە بۆ ماڵی خۆمان لە بارزان.

دوای ئەوەش هەواڵم پێگەیشت کە داوایان لە دوو هاوڕێی نزیکیشم (داود عوسمان و مەحمود عوسمان) کردوە کە بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان لە هەولێر.

بێگومان سوپاسی خودام کرد کە هەندێك دوربین بووم و داوام لە کەس نەکرد ببێتە هاوڕێم بۆ ئەوەی پێکەوە بچینە ناو بزوتنەوەکەوە. ئەگەر نا دواجار چۆن دەمتوانی ئەم رەفتارەیان بۆ لێکبدەمەوە؟

سەبارەت بەخۆم دوای ئەوەی کە تێگەیشتم قسەکردن لەو بارەوە سودی نیە گەڕامەوە بۆ بارزان.

هەرچەندیش ئەوەم بیر خستنەوە کە من لەسەر داوای ئەوان هاتوم، بەڵام بێهودە بوو.

لەگەڕانەوەمدا بۆ بارزان سەردانی شێخ محەمەد خالید بارزانیم کرد لە بارەگاکەی خۆی لە گوندی زرارا.

دوای ماوەیەك لە بارزان هەواڵی ئەوەم پێ گەیشت کە شێخ محەمەد خالید بارزانی رەخنەی لە هەڵوێستی ئیدریس و مەسعود گرتوە و سەرپشکی کردون لە نێوان دو شتدا: یان دەبێت کارێکی شیاوم پێ بدەن، چونکە هاتنە دەرەوەی من لەسەر داوای ئەوان بوە، یان خۆی –شێخ محەمەد خالید– لەناو ریزەکانی پێشمەرگەی سەر بەخۆیدا کارێکم پێ دەبەخشێت.

دوای ماوەیەك لە لایەن مەسعودەوە هەواڵم پێ گەیشت، تیایدا داوای کردبوو بگەڕێمەوە بۆ ناوچەی باڵەکایەتی و لەوێندەر پێی گوتم کە کاری بێتەل بگرمە دەست بەڵام من پێم گوت کە هیچ شارەزاییەکم لەو بوارەدا نیە، بۆیە داوای لێ کردم بگەڕێمەوە بۆ بارزان منیش بە قسەم کرد.

پێدەچێت شێخ محەمەد خالید جارێکی تریش پرسەکەی وروژاندبێت، لە ئەنجامدا ئیدریس ناردبوویەوە بە شوێنمدا بۆ ئەوەی بچم بۆ لای لە ناوچەی باڵەکایەتی، لە کاتی دیدارەکەدا ئیدریس بەم شێوەیە کەوتە قسەکردن:

تۆ دەزانیت هەزاران کەس لە خەڵکی شارەکان هاتونەتە ریزی بزوتنەوەکە و تەنانەت دۆڵەکانیش پڕ بوون و شوێن بۆ خێزانەکانیش نەماوەتەوە، ئەو رەوشەش دیاردەیەکی نوێیە و لە رابوردودا شتی وامان بەخۆوە نەدیوە. ئینجا ئەگەر ئەوەش لەبەر چاو بگرین کە بۆمبارانی فڕۆکە و تۆپەکانی حکومەت هیچ

جیاوازی ناکەن لەنێوان شوێنە سەربازی و سڤیلیەکاندا، بەڵکو و هەموویان وەك یەك بۆمباران دەکەن، بۆیە دەبێت پێشبینی ئەو هەموو زیانە گەورەیە بکەین کە بۆمبارانی حکومەت لە نێو خەڵکانی سیڤیل دەیخاتەوە. بەر مەبنای ئەمە، بزوتنەوەی کورد بە هەماهەنگی لەگەڵ حکومەتی ئێران رێك کەوتووین لەسەر ئەوەی لەناو خاکی ئێران کامپ بۆ پەنابەران بکەینەوە، بۆ ئەوەی بتوانین ئەو خەڵکە زۆرەی هاتونەتە ناو ریزەکانی بزوتنەوەکەوە، ئەوانەی کە ناتوانین لە ناوچە ئازادکراوەکاندا شوێنی سەلامەتیان بۆ دابین بکەین، لە ئێران جێیان بۆ دابین بکەین. ئێمە ئێستا دەستمان بەم کارە کردوە بەڵام ناتوانین بە باشی کۆنترۆڵی رەوشەکە بکەین، بۆیە هیوادارم تۆ ئەم ئەرکە بگریتە ئەستۆ، نابێت لایەنی رەوشتیشمان بیر بچێت، چونکە بەلای ئێمەوە ئەم لایەنە گرنگترین شتە. ئێمە دەزانین لەو کامپانەدا ژنی زۆر هەن، کە دورن لە مێردەکانیانەوە. خۆ ئەگەر بتوانیت ئەو کامپانە کۆنترۆڵ بکەیت ئەوە ئێمە ئەم کارەت هەرگیز لە یاد ناکەین.

لەو کاتەدا بەڵێنم دا بە ئیدریس کە بە هەموو توانای خۆم هەوڵ دەدەم ئەو ئەرکە بە باشترین شێوە راپەرێنم. دەبێت ئەوەش بڵێین کە من هەستم دەکرد ئەم ئەرکە لەگەڵ خوێندنەکەمدا کە لە کۆلیژی پۆلیسی و یاساش وەرمگرتوە دەگونجێت، چونکە ئەم ئیشە لە لایەکەوە رێوشوێنی توند و دیسپلینکردنی دەویست. لە لایەکی تریشەوە جۆرێك لە لێزانینی یاسایی و دیپلۆماتی دەویست.

## سەرۆکایەتی لیژنەی باڵای کاروباری پەنابەران

لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێراندا لەسەر ئەم بنەمایەی خوارەوە رێککەوتین: ئێمە بەرپرسین لە هەموو کاروبارە ناوخۆییەکانی ئەو کامپانە و ئێرانیەکانیش بەرپرس دەبن لە پاراستنی دەرەوەی کامپەکان.

ئەم رێسایەش کارایی خۆی سەلماند، چونکە دوای ئەوە هیچ ناچار نەبووم دەست بخەمە ئیشوکارەکانەوە، تەنیا یەکجار نەبێت —وەك لە بیرم بێت ئەوەش کاتێك بوو کە هەواڵم پێگەیشت ئەفسەرێکی ئێرانی لە کامپی زێوە

ڕەفتاری نەشیاوی نواندوە، بە شێوەیەك کە پێچەوانە بێت لەگەڵ داب و نەریتی خۆرهەڵاتیانە، چونکە خۆی لە ژنان نزیك خستۆتەوە، ژنانیش لە کامپەکاندا زۆر زۆر بوون بەراستی. لەوێدا هەستم کرد دەبێت بێ هیچ ئەملاو لایەك پرسەکە یەکلایی بکەمەوە لەو خاڵەدا، ئەوەش لە پێناوی ئەوەدا کە ڕەفتاری هەندێك کەس ڕێك بکەمەوە، ئەگەر نا دوایی ناتوانین کۆنترۆڵی ڕەوشەکە بکەین. زۆر بە ڕاشکاوی ئێرانیەکانم تێگەیاند کە ئێمە بە هیچ شێوەیەك ڕازی نابین ئەوان دەست لە کاروباری ناوخۆی کامپەکان وەربدەن، بەتایبەتیش ئەو ئەفسەرەی ڕەفتارە ناشیرینەکەی نواندبوو تێمگەیاند کە ئێمە ئامادە نین ڕەفتارەکانی قەبوڵ بکەین و وا باشترە دەست لەو هەڵسوکەوتانەی هەڵبگرێت و سەرقاڵی کاروباری دەرەوەی کامپەکە بێت. بێگومان هەندێك لە ئێرانیەکان هاتنە ناو کێشەکە و بەرگرییان لە ئەفسەرەکەی هاوڕێیان دەکرد، کە گوایە ئەفسەرێکی ئازایە و پاساوی لەو جۆرەیان دێنایەوە. وەڵامی منیش ئەوەبوو: ڕەفتارەکەی بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە ئازایەتیەوە نیە و دەبێت دەست لەو کارانەی هەڵبگرێت، ئیدی بە شێوەیەك خۆمان دەمانویست پرسەکەمان یەکلا کردەوە.

پاش ماوەیەك مەسعود هەواڵی بۆ ناردین کە سەردانی ئێران دەکات و بە شێوەیەکی فەرمی بە بەرپرسانی ئێرانمان دەناسێنێت. لەو کاتەدا لەگەڵ تیمسار سەیادیان چاوپێکەوتنمان کرد، ئەو پیاوە بەڕێوەبەری ئاسایشی ئازەربایجانی خۆرئاوا بوو. کەسێکی هێمن و لەسەرەخۆ بوو، بە هێمنی دەدوا، کەسایەتیەکی هاوسەنگ و قورس بوو لەکاتی قسەکردنندا زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی هەبوو. هێدی هێدی ژمارەی پەنابەران زیادیکرد و ژمارەی کامپەکانیش بە درێژایی سنوور زیادی دەکرد، هەر لە زێوەوە لەسەر سنورەکانی تورکیا تا دەگاتە دیزفول لە پارێزگای خۆزستان. مافی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی کامپەکانمان خستبوە دەستی خەڵکی کامپەکان خۆیان و ئێمە هیچ لیژنەیەکمان بەسەردا نەدەسەپاندن، کەسیشمان دەرنەدەکرد، مەگەر کەسێك نەبێت کە ڕەفتاری خراپی نواندبێت، یان خراپ کەڵکی لە پۆستەکەی وەرگرتبێت. لە ڕاستیدا ئەوەش زۆر دەگمەن بوو.

# سەرەتای بڵاوبونەوەی هەواڵی ڕێککەوتنی عیراق و ئێران

پەیوەندیی نێوان بزوتنەوەی کورد و حکومەتی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شەستەکان. دواجار ئەو پەیوەندیانە بەرەو پێش چوون، تا وای لێهات حکومەتی ئێران ببوە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتی و بزوتنەوەی کورد لە حەفتاکان پشتی پێدەبەست. پشت پێبەستنەکەش لەو کاتەدا هەموو لایەنەکان دەگرتەوە، لە پێش هەموشیانەوە کۆمەکی دارایی و سەربازی. وێڕای ئەوەی حکومەتی ئێران دەروازەی سەرەکیی بزوتنەوەی کورد بوو بۆ پەیوەندیکردن بە جیهانەوە.

سەبارەت بە ئەزموونی خۆم لەگەڵ دەسەڵاتی ئێران، پێویستە ئەوە بڵێم ئەوان زۆر بە باشی کۆمەکی پەنابەرانیان دەکرد. حکومەتی ئێران هاوکاری کردین بۆ بنیاتنانی کامپەکان (لەپێشدا چادر گەبوون) بەڵام بە خێرایی بوون بە خانوو. هەروەها دابینکردنی خواردنی تەندروست و دەرمان. بەڕاستی باش بوون، هەرچەند کادیرە پزیشکیە ئێرانیەکانی ناو کامپەکان شارەزاییان کەم بوو. بێگومان پاش چەند ساڵێك ڕەوشەکە گۆڕانی بەسەردا هات، چونکە ئێرانیش کادری پزیشکی شارەزای هەبوو، بە شێوەیەك کە دەیتوانی شانازییان پێوە بکات، چونکە حکومەتی ئێرانی بە باشی بایەخی بە کەرتی تەندروستی دەدا.

بە هۆی ئەوەی سەرۆکی لیژنەی باڵای پەنابەرانی کورد بووم لەو ماوەیەدا، پەیوەندیەکانی من بە زۆری لەگەڵ تیمسار سەیادیان بوو لە ڕەزاییە (ورمێ) و تیمسار مەنسور پور لە کۆشکی شاهینشاهی، ئەمە وێڕای دکتۆر شیبانی، ئەمە بەرپرسە گەورەکانی لایەنی ئێران بوون کە پەیوەندیمان لەگەڵیان هەبوو. بێگومان بەرپرسە پلە نزمەکانیش کە پەیوەندیمان لەگەڵیان هەبوو لە

کامپەکاندا زۆر بوون، دیارترینیان ئاغا شێخ و ئاغای مەزهەری، ئەوان ئەفسەری دەزگای ساواك بوون و هەردوکیان زۆر لێهاتوو بوون، بە راستیش لەگەڵ پەنابەراندا زۆر بە ئەدەب بوون. لەگەڵ ئەمەی دواییان روداوێکی سەیرم هەبوو. ئێمە سەردانی ورمێمان کرد بۆ رایيکردنی کارەکانمان، دوای تەواوبوونمان چووینە چێشتخانەیەکی ناو شار بۆ نانخواردن، دوای ماوەیەك ئاغای مەزهەری هات و لەگەڵ ئێمە دانیشت بۆ نانخواردن، بەڵام سەیری کاتژمێرەکەی کرد و گوتی: بەڕێز بارزانی من دوای پێنج خولەکی تر دەتوانم لەم چێشتخانە فراوانە هاوولاتییە ئێرانی و عیراقیەکان لێك جیا بکەمەوە. منیش بەلامەوە سەیر بوو، گوتم: ئەوە کارێکی ئاسان نابێت. بەڵام ئەو گوتی: ببینە چی روو دەدات.

کتوپڕ گوێمان لە دەنگی فڕۆکەیەك بوو هەوڵی نیشتنەوەی دەدا لە فڕۆکەخانەی رەزاییە ، بەو هۆیەشەوە زرمەیەکی گەورە دروستبو کە بوە هۆی لەرینەوەی پەنجەرەکانی چێشتخانەکە. لەو کاتەدا شتێك روویدا کە من هەرگیز بیرم لێ نەکردبۆوە، زۆربەی ئەوانەی لە چێشتخانەکەدا بوون لەسەر زگیان راکشان و هەوڵیان دەدا لەژێر مێزی چێشتخانەکەدا خۆیان بشارنەوە، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە ئێستا بۆمباران دەکرێن، وەك ئەوەی لە کوردستانی عیراق رۆژانە دوچاری دەبوون ئاغای مەزهەری لەم کاتەدا ئاوڕێکی لێ دامەوە و بە خەندەیەکی شەیتانیەوە گوتی: پێم نەگوتی ئێستا دەزانم کامانە عیراقین؟

ئەوان لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ من و پەنابەرانیش زۆر بەڕێز بوون و لە رەوشی خەڵکەکە تێدەگەیشتن، ئەوەش دەریدەخست کە مەشقی باشیان پێکراوە و ئەزمونی باشیان هەیە، بە دوریشی نازانم مەشقی ئەوروپی کاریگەریی هەبوو بێت لەسەر رەفتاریان.

بێگومان لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە ئێمە باسی دەزگایەکی ناسراوی هەوالگری دەکەین کە لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست، بەڵکو دەشێت لە جیهانیش ناسراو بێت. ئەو دەزگایە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئێرانیەکاندا بەوە ناسراوە کە پەنای دەبردە بەر توندوتیژی. خۆم بەڕێکەوت یەکێك لەو توندوتیژیانەم لە رەزاییە بینی، کاتێك بینیم کۆمەڵێك لە ساواك لە هاوولاتیەکیان دەدا و بەرشەقیان دەدا لە فەرمانگەکاندا، ئەویش هاواری

دەکرد: بە خودا من شاهینشا و نیشتمانم خۆشدەوێت. کاتێك یەکێکیان هەستی بە بوونی من کرد لەو شوێنەدا، گوتی: لێی بدەن بەڵام نەك بە ئامادەبونی بەڕێز بارزانی.

هۆی سەردانیشمان بۆ ئەو فەرمانگەیە بۆ ئازاد کردنی ئەفسەرێکی تۆپخانە بوو (کەمال پێدەیی) چونکە ئەو بە هەڵە وێنەی سەرکردایەتی فیرقەی سەربازی لە رەزاییە گرتبوو. ئێمە داوامان کرد تا دیدارێك لەگەڵ تیمسار سەییادیان بکەین بۆ ئەوەی هۆکارەکەی بۆ رون بکەینەوە و پێی بڵێین پرسەکە پەیوەستە بە پێشمەرگەیەکی ئازامانەوە و هیوادارین چاوپۆشی بکات لەو هەڵەیەی کردویەتی، چونکە زمانی فارسی نازانێت. بەڵام ئاماژەم بەوە نەکرد کە ئەفسەرە، تاکوو زیاتر پرسەکە نەئاڵۆسکێنین. زۆر چاوەڕوانمان نەکرد، کاتێك بینیمان ئەفسەرێك گەڕایەوە بۆ لامان و وەڵامی تیمسار سەیادیانی هێنابوو (وەك رێزێك بۆ بەڕێز عەبدولمسەور، ئەو زیندانیە ئازاد دەکەین).

جارێکیش لە دیزەفول سەرنجی توڕەبوونی دکتۆر شیبانیم دا، بەڵام وێرای ئەوەش بیرم نایەت هیچ کامیان داوایەکی منیان رەت کردبێتەوە ، بە تایبەتی ئەگەر دلواکەم پاساوێکی جوانی هەبوایە بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ بەرامبەر بکەم تاکوو بە جوانی تێ بگات و قسەکانم وەربگرێت.

یەك جار نەبێت لە دیدارێکی تایبەتدا داوایەکم پێشکەش بە تیمسار سەیادیان کرد بۆ ئەوەی ئاغای ئاخوند، کە بەرپرسێکی ساواك بوو لە خانە، تێ بگەیەنێت تاکوو هەندێك نەرم و نیان بێت لەگەڵ پەنابەران، خۆ ئەگەر بشێت بیگۆڕن باشترە، چونکە هەندێك جار توند و رەق بوو لەگەڵ پەنابەران، بەڵام تیمسار سەیادیان هەر بە زەردەخەنەوە وەڵامی دامەوە: گوتی (ئاغای بارزانی هیوادارم تێ بگەیت کە ئەم جۆرە کەسانە لە هەردوولا هەن، ئەگەر تۆ ئەحمەد حاجی بگۆڕیت ئەوا منیش ئاخوند دەگۆڕم).

ئیدی دەستبەجێ تێگەیشتم کە ئەو کەسە لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە جێی متمانەیە و پێگەی خۆی هەیە و هاوتای ئەحمەد حاجیە کە لای بزوتنەوەی کوردی متمانەیەکی تەواوی پەیدا کردبوو و نەدەتوانرا بگۆڕدرێت، بۆیە وا پێویست بوو دەست لەو داوایە هەڵبگرم و نەیکەم بە رێگرێك لە بەردەم شتی گرنگتردا، ئەویش پەیوەندیە باشەکان و رێزی نێوانمان بوو.

## سەرەتای گومانکردن لە گۆرانی هەڵوێستی ئێران

لە سەردانێکی چاوەڕواننەکراوی تیمسار مەنسوردا بۆ کامپی نلیوان کە نزیکترین کامپ بوو لە شنۆوە، بارەگای لیژنەی باڵای پەنابەرانی کورد لەوێندەر بوو، داوای لێکردین لە کامپەکە بیبینین.

مەنسور پور لە هەموو ئەو بەرپرسە ئێرانیانەی دەمبینین رێکپۆشتر بوو، هەروەها کەسێکی هێمن بوو قسەکانی لە چەند وشەیەکی کەمدا بە جوانی دادەڕشت و بە جوانی مەبەستەکەی خۆی دەگەیاند.

لەم دیدارەدا بە لەسەرەخۆیی و بە جوانی ئاماژەی بەوە کرد کە هەندێك زانیاریی باوەڕپێکراوی پێگەیشتوە. کورتیەکەی ئەوەیە، زۆر لە پێشمەرگەکان ئێستا لە کامپی ئاوارەکان نیشتەجێن، لە کاتێکدا دەبوو ئەوان لە بەرەکانی جەنگدا بن. ئینجا گوتی: لەم بارەدا بەرەی جەنگ لاواز دەبێت کە ناشێت شتی وا روبدات، لەبەر ئەوەش داوای هاوکاریی کرد، ئەوەش داوایەکی تەواو بەجێ بوو.

وەڵامی منیش ئەوە بوو، داوام کرد لە هەر کامپێك پزیشکێکی لێهاتووی ئێرانی دا بنێن، با تەنیا ئەو بڕیاری مۆڵەتدانی هەبێت بەو پێشمەرگانەی بەهۆی تەندروستیانەوە لە ماوەی مۆڵەتدانیان زیاتر لە کامپەکان دەمێننەوە ، ئەوانەی تریش دوای کۆتاییهاتنی مۆڵەتەکانیان دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سنوری عیراق.

بەم قسانەی من مەنسور پور گەشایەوە گوتی: بیرۆکەیەکی باشە و هەوڵدەدەین کاری لەسەر بکەین.

ئینجا ئاماژەی بەوە کرد کە ئۆتۆمۆبێلی عیراقی لە ناو ئێران زۆر بووە. بەتایبەتی لە ناوچە سنورییەکان، ئەوەشی وەك دیاردەیەکی ناپەسەند دادەنا.

منیش بەڵێنم پێدا کە هەوڵی تەواو دەدەم بۆ بنەبڕکردنی ئەو دیاردەیە تا وای لێ بکەین لە بازنەیەکی تەسکدا بمێنێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر حکومەتی ئێران ئامرازی گواستنەوەی پێویست بۆ کامپەکان دەستەبەر بکات، بۆ ئەوەی هاتوچۆ بە خەڵك بکات بۆ کامپەکان. ئەو پێشنیارەشی پەسند کرد.

لەم قسانەدا بووین هەواڵمان پێگەیشت کە برینداریێك لە بەرەکانی شەڕی گۆڕەزی گەلی عەلی بەگ، گەیشتۆتە ئێران و قاچێکی لە دەستداوە بە هۆی ئەوەی پێی ناوە بە مینێکدا. لێرەدا داوام لە تیمسار کرد چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەو پێشمەرگە ئازایە بدۆزێتەوە. تیمسار هیچ نەوەستاو داوای لە سەربازێکی خۆی کرد کە تەلەفۆنە سەبارزیەکەی لێ نزیك بخاتەوە و پەیوەندی بە لایەنێکەوە کرد تاکوو هێلیکۆپتەرێکی سەربازی بنێرن بۆ ئەوەی ئەو بریندارە بگوێزێتەوە بۆ تەورێز و لەوێ چارەسەر بکرێت. لە راستیدا بەدەمەوە هاتنەکەیم زۆر بە دڵ بوو، دواتر ئەو پێشمەرگەیەم لە هۆتێلی دیامۆندا بینی لە تاران، پێش ئەوەی گەشت بکەم بۆ نەمسا. ئەو زۆر سوپاسی کردم بۆ ئەو هاوکاریەی وەری گرتوە. بەڵام من زۆر بە هێمنی بۆم روونکردەوە کە ئەوە ئەرکی خۆم بوەو هیچ سوپاسێکی ناوێت.

لێرەدا من بە پێویستیەکی ئەخلاقیم زانی کە سوپاسی تیمسار مەنسور بکەم، بەڵام سەیرم لە وەڵامەکەی هات، کاتێك هەر بەو هێمنیەی پێی ناسرابوو و بە روونی وەڵامی دامەوە گوتی:

(سوپاسی من مەکە لەسەر هیچ شتێك، ئەوەی روو دەدات هەرچیەك بێت دەگەڕێتەوە بۆ خاوەن شکۆ شاهێنشا، چونکە ئێوە میوانی ئەون و ئەم کارە هیچ پەیوەندیەکی بە منەوە نیە).

بیستبووم کە مەنسور پور کوردە و خەڵکی سنەیە لە پارێزگای کوردستانی ئێران، لە راستیدا سەیرم لە کاردانەوەکەی هات و کەوتمە پرسیار کردن لە خۆم، سەبارەت بەوەی کەسێکی وا نەرم و نیان و بە ئەدەب بەو شێوەیە هەڵوێست وەربگرێت چونکە ئێرانیەکان لە هەڵوێستێکی لەو شێوەیەدا دەڵێن: شایانی نیە، ئێمە لە خزمەتداین، یان هەر شتێکی لەو شێوەیە دەڵێن ...هتد.

لە راستیدا ئێمەش لە لای خۆمانەوە کەمتەرخەمیمان نەدەکرد لە بەجێهێنانی ئەرکەکانماندا، ئیتر دەستمان کرد بە گێڕانەوەی ئۆتۆمبیل و پێشمەرگەکان بۆ ئەو دیو سنوور و داوامان لە برایانمان کرد لەو دیو کە هاوکاریمان بکەن بۆ ئەوەی بتوانین بەڵێنەکانمان بەجێ بێنین. بەڵام لە راستیدا کۆنترۆڵ کردنی ئەو شتانە قورس بوو چونکە مۆڵەتی زۆر دەدرا بە پێشمەرگە،

ئەوەش بە هۆی ئەوەی کەسانی خاوەن پلەو مەقام نێوندگیرییان دەکرد بۆ پێشمەرگەکان تاکوو مۆڵەتیان پێ بدرێت.

بە تێپەڕبوونی کات و خوێندنەوەی روداوەکان و بیستنی هەواڵی زیاتر لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا سەبارەت بە دیداری نێوان شاندەکانی عیراق و ئێران بە مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەکانی نێوانیان، ئەو ئامازانە زیاتر بوون کە هەردوولایەن خەریکن رێکدەکەون.

من سەرۆکی لیژنەی باڵای پەنابەرانی کورد بووم، ئەوەش واتە دەبوو هەوڵ بدەم ئاییندەیەکی باشتریان بۆ دابین بکەم، بۆیە بە پێویستم زانی بزوتنەوەی کورد لەو هەواڵانە ئاگادار بکەمەوە. ئەوە بوو دوو نامەم نارد، یەکێکیان بۆ مەکتەبی سیاسی و ئەویتریشیان بۆ هەردوو برا ئیدریس و مەسعود سەبارەت بەو بابەتە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیم بە باشی نەدەناسی، بۆیە سەبارەت بەم خاڵە زیاتر جەختم لەسەر ئیدریس و مەسعود کردەوە. بێگومان ئەوەش بە هۆی ئەوە بوو کە خۆم خزمی ئەوانم و لە هەمان کاتیشدا باشتر دەیانناسم و لە دێر زەمانەوە ناسیاویمان هەیە. بێگومان هیوام وابوو کە گەیشتنی ئەو هەواڵانە پاڵیان پێوە بنێت تاکوو پلانێکی ئەلتەرناتیف دابرێژن بۆ ئەوەی بتوانن روبەرووی هەر روداوێکی نوێ ببنەوە ئەگەر روویدا.

بێگومان وێڕای بەسەرکردنەوەی کاروباری پەنابەران لە کامپەکانی سەر سنوور هەر لە زێوەوە تا دەگاتە دێزەفوول، پەیوەندیی بەردەوامیشم هەبو بە بەرپرسیارانی ئێرانیەوە سەبارەت بە کاروباری پەنابەران. دەبێت دان بەوەدا بنێم کە لە سەرەتاوە ئێرانیەکان زۆر بە باشی بە دەم داواکانمانەوە دەهاتن، تا رادەیەك پێشنیاری ئەوەیان کرد کە هێلیکۆپتەرێك بخەنە خزمەتمان بۆ ئەوەی بتوانین سەردانی کامپەکان بە خێرایی و بە شێوەیەکی ئاسانتر ئەنجام بدەین. هەروەها ئیدریسیش پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئۆتۆمۆبێلێکم بدەنێ، گوتی: تۆ لە هەموو کەس زیاتر هاتوچۆ دەکەیت، لەبەر ئەوە شایستەی ئەوەیت ئۆتۆمۆبێلێکی تایبەت بە خۆت هەبێت لەبری ئەوەی هەموو جارێك بە ئۆتۆمۆبێلی کرێ هاتوچۆ بکەیت.

هەروەها ئێرانیەکان بۆ ئەوەی کارئاسانی زیاترم بۆ بکەن، ئەوەیان زیاد کرد کە دەبێت لە ئوتێلێکی گەشتیاری بمێنمەوە (میهمان سەرا) لە کاتی

پێویستدا، لەبری ئەوەی لە کامپەکاندا بمێنمەوە، ئەویش تەنیا بەرامبەر بە واژۆکردنی پسوڵەیەك دوای دەرچوونم لە ئوتێل واژووی بکەم، ئەوەش لە بری ئەوەی کرێ بدەم، بەڵام لە راستیدا من ئەو پێشنیارەم رەتکردەوە و سوپاسم کردن، هەروەك چۆن پێشنیاری هێلیکۆپتەرەکەشم رەتکردەوە.

یەکەم لەبەر ئەوەی بە گونجاوم نەدەزانی پەنابەری کورد کە لە بارێکی نائاسایی و ناجێگیر دایە، من ببینێت لە ئاسمانەوە بە هێلیکۆپتەر سەردانی کامپەکان دەکەم، ئەوەش دەبێتە هۆی لێك دورکەوتنەوەی هەردوو لا و پێدەچێت جۆرێك لە بێ متمانەییش دروست بکات، لێرەوە وێرای سەختیەکان بەلام پێم باش بوو هەر بە ئۆتۆمۆبێل هاتوچۆ بکەم.

دووەم، لەبەر ئەوەی پێم وابوو کە بەرککەوتنی راستەوخۆ و بەشداریکردنم لە چارەنوسیاندا دەشێت متمانەیەکی زیاتر لە نێوان هەردو لادا دروست بکات، لەبری ئەوەی جیاوازیەکان زیاتر بکەین لە نێوانداو ئەوەش سەر دەکێشێت بۆ دروستبوونی گلەیی و رەخنەی زیاتر. چونکە بەشداریکردنی دانیشتنم لەسەر یەك سفرە لەگەڵ پەنابەران هەلی ئەوەشم بۆ دەرەخسێنێت کە لە نزیکەوە جۆری خواردنیان بزانم. لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە بزوتنەوەی کورد بودجەیەکی کەمی بۆ پەنابەران تەرخان کردبوو بۆ رایی کردنی کارەکانیان. بەلام من مکوڕ بووم لەسەر ئەوەی ئەو بودجەیە لە باری زۆر نالەباردا نەبێت بەکاری نەهێنم. کەم نین ئەو جارانەی کە پارەو ماڵی خۆم خەرج کردوە بۆ ئەوەی هەندێك کەلەبەری پێ پڕ بکەمەوە، وەك پارەی نانخواردن لە چێشتخانەکان، بۆ ئەوەی پارەی لیژنەی پەنابەران بەفیڕۆ نەدەم.

دوای ئەوەی پرسی چۆنێتی سودوەرگرتن لە دارایی لیژنەکە سەرکردایەتیی کوردەوە بە کەسێکی تر سپێردرا ورووژێنرا دەست کرا بە باس کردنی ئەوەی کە چۆن من ئەو داراییەم بۆ پەنابەران بەکار دەهێنا و چۆن کەسانی پاش من بەفیڕۆیان دەدا.

لە راستیدا ئێمە هەوڵی زۆرمان دەدا بۆ پاراستنی دارایی گشتی و هەوڵمان دەدا بە فیڕۆی نەدەین، چونکە دارایی گشتی ئەمانەتە لە گەردنی بەرپرسەکان و لە کۆتاییشدا مولکی گەلە و دەبێت هەر لە شوێنی دروستی خۆیدا خەرج

بکرێت و هەر دەرچونێکیش لەم رێسایە وەك ئەوەی لە کاروباری کەسیی خۆتدا خەرجی بکەیت، بە ناپاکیکردن لە ئەمانەت دادەنرێت.

ئەوانەی لە لیژنەکە لەگەڵمدا بوون ئەو راستیە بە باشی دەزانن.

لەگەڵ پزیشکێکدا کە لەناوچە ئازادکراوەکانەوە دەرمانی بۆ دێنایین گرفتمان هەبوو، ئەو دەرمانانەش زۆر جار لە رێگەی کۆمەکەکانی ئەو لایەنانەوە بوو کە هاوسۆز و پشتیوانی بزوتنەوە رزگاری خوازەکانی جیهان بوون، کەچی ئەو پزیشکە دەچوو لە شنۆ و نەغەدە لە ناو ئێران بە نرخێکی هەرزان دەرمانەکانی دەفرۆشتەوە.

هەرچەند زۆر هەوڵماندا کاری تێ بکەین بۆ ئەوەی واز لەو خووە بێنێت، بەڵام ئەو مکوڕ بوو لەسەر ئەو کارەی، چونکە پێی راهاتبوو. بەڵکو ئەو کەسە بە هۆی ئەوەی خزمایەتی لەگەڵ هەندێك گەورە بەرپرسی ناو جوڵانەوەکە هەبوو، بەتایبەتی ئەوانەی زۆر لە سەرکردەی بزوتنەوەکە نزیك بوون، لە کاتێکدا ئێمە لەوێ نەدەبووین و دەگەڕاین بەسەر کامپە دورەکانی ئاوارەکاندا، ئەو سوکایەتیی بە هەندێك لە ئەندامانی لیژنەی باڵای پەنابەران دەکرد. دوای گەڕانەوەشم دیسان فرۆشتنی دەرمان بە شێوەیەك کە هەمومانی توڕە دەکرد، بەردەوام بوو. بۆیە دەبوو هەڵوێستێکی توند بگرینە بەر تا رێگەی لێ بگرین. بۆیە ئەو کەسەمان بانگێشت کرد بۆ بارەگاو زۆر بە توندی لێپێچینەوەمان لەگەڵ کرد لەسەر ئەو کارە خراپانەیی و سوکایەتیکردنی بێ پاساوی بە ئەندامانی لیژنەی پەنابەران. دوای ئەوە گێڕامانەوە بۆ ناوچە ئازادکراوەکان و لەگەڵ خۆیشیدا نامەیەکمان پێدا نارد بۆ هەردوو برا، ئیدریس و مەسعود، و داوامان لێ کردبوون کە بەتەواوەتی رێگەی لێ بگرن بۆ گەڕانەوە بۆ ئێران و نواندی ئەو هەڵسوکەوتە ناشیرینە.

بەڵام ئەوەی سەیر بوو رۆژی دوایی هەواڵی ئازاد کردنیمان پێگەیشت.

ئەزمونێکی ترمان هەبوو، بەو هۆیەوە نەماندەتوانی لەو میکانیزمانە تێ بگەین کە لە ناوچە ئازادکراوەکان کاریان پێ دەکرێت بەتایبەتی لە هەندێك پرسدا کە لای ئێمە زۆر گرنگ بوو. ئەوە بوو لە لایەن چەند مەفرەزەیەکەوە سیخوڕێك دەستگیر کرابوو، ئەو سیخوڕە نەخشەیەکی پێ گیرابوو، لەو نەخشەیەدا شوێنی هەموو تۆپەکانی دژ بە فڕۆکە جەنگیەکان لە حاجی

ئۆمەران دیاری کرابوو، کە لەو شوێنەدا ماڵی سەرکردەی بزوتنەوەکەش هەبوو. هەندێکجار ئەو دەچوە ئەو شوێنە، هەرچەند تاکە شوێنیشی نەبوو. نەخشەکە ژمارەی تۆپەکان و ژمارەی تۆپە لە کارکەوتوەکان، ژمارەی کەسەکان، ژمارەی مۆڵەت پێدراوەکان، و چەندین زانیاری سەربازیی گرنگی تێدابوو کە هەموو بزوتنەوە ئازادیخوازەکانی جیهان هەوڵ دەدەن ئەو زانیاریانە بپارێزن و نەهێڵن بکەوێتە دەستی دوژمن. بێگومان پێش ئەوەی هەر رێوشوێنێك بگیرێتە بەر، دەبوو راستی و دروستی ئەو زانیاریانە پشتڕاست بکرێنەوە، بۆیە کەسێکمان رەوانە کرد بۆ پەیگیری کردنی راستیەکان، وەڵامەکەش توشی شۆکی کردین، چونکە زانیاریەکانی ناو راپۆرتەکە تەواو راست بوون. ئەی ئەو کەسە لە کوێوە ئەو زانیاریانەی پێگەیشتوە؟

بۆیە ئەو کەسە بە دەستگیرکراوی نێردرا بۆ گرتوخانەی خەلان و لایەنی پەیوەندیداریش لە پرسەکە ئاگادار کرایەوە، بەڵام دیسان هەواڵێکمان پێگەیشت دەیگوت: ئەو کەسە ئازاد کراوە و ئێستا بە ئازادی لە شەقامەکانی کەلالە پیاسە دەکات.

بۆیە بە پێویستم زانی کە لەگەڵ شەکیب ئاکرەیی لەو بارەوە قسە بکەم بە هیوای ئەوەی شەکیب لێکدانەوەیەکی مەنتیقی هەبێت بۆ ئەو روداوە. بەڵام دوای گفتوگۆ شەکیب بە کورتی رای خۆی بەم شێوەیە دەربڕی: لێرە ئیش بەم شێوەیە بەڕێوە دەچێت.

## بانگهێشت کردنم بۆ حاجی ئۆمەران

لە کاتی کارکردنم وەك سەرۆکی لیژنەی پەنابەران، لەبەر پێویستی ناچار بووم پەنا بەرمە بەر لێپرسراوانی ئاسایشی ئێرانی بۆ ئەوەی رۆژنامەنوسێکی فەرەنسی ئازاد بکەن کە لای ئەوان دەستبەسەر بوو لە نەغەدە. پێدەچوو دەزگای هەواڵگری ئێران ویستبێتی رێگری لێ بکات بۆ ئەوەی نەچێتە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عیراق و بابەتێك لەسەر رووداوەکانی ئەو کاتە بنوسێت.

هەروەها خانمێکی نێردراوی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان سەردانی بارەگای لیژنەی باڵای پەنابەرانی کرد، خانمەکە هەندێك پرسیاری کرد دەربارەی رەوشی گشتی لەو ماوەیەدا، لە نێوانیشیاندا پرسیاری کرد سەبارەت بە رەوشی ئاوارەکان، بۆیە من سەبارەت بەرەوشی ئاوارەکان راستیەکەم پێگوت کە تا ئەو کاتە باش بوو، بەڵام بە باشم زانی باسی رەوشی خەڵکی بادینانیشی بۆ بکەم چ رەوشی ئاوارەکان یان ئەوانیتر بێت، چونکە ئەوێ ناوچەیەکی دوورە دەست و دابڕاو بوو، بۆیە لەو کۆمەکیانەی لە سنورەکانی ئێران بەسەر ئاوارەکاندا دابەش دەکران، هیچ بەوان نەدەگەیشت. لەو کاتەدا ناوچەی بارزان بە تەواوەتی دایە پاڵ بزوتنەوەکە، ئیدی بە تەواوەتی بێبەش کرابوو لە تاکە سەرچاوەی کۆمەك، کە ئەو ناوچەیە تا ئەو کاتەش سودی دەبینی لە بێلایەنی خۆی بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی پێ بگات.

بۆیە تکام لەو خانمە کرد کە هەوڵی خۆی بدات بۆ ئەوەی بە هانای ئەوانەوە بچێت بەپێی توانا، بەڵام ئەو خانمە قسەکانی منی سەبارەت بە ناوچەی بادینان بەلاوە سەیر بوو، چونکە تا ئەو کاتە کەس باسی ئەو بابەتەی لەگەڵ نەکردبوو. منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: پێدەچێت هەر بارزنە و لقێك کاری لە پێشینەی خۆی هەبێت بۆ ئەوەی بایەخی پێبدات، منیش بەو سیفەتەی

سەرۆکی لیژنەی باڵای پەنابەرانم، پێم وایە گرنگیدان بە کاروباری ئەوان بەلای منەوە گرنگترین شتە. ئەو خانمە بەڵێنی پێدام کە بەزوترین کات ئەو هەواڵە بگەیەنێتە دەزگای خۆیان لە بێروت و داوایان لێبکات بە خێرایی بەدەمیانەوە بچن و کۆمەکی ناوچەی بادینان بکەن، لە رێگەی ناردنی کەلوپەل و خواردەمەنی و شتی ترەوە. لە دواییدا هەندێك زانیاریمان پێگەیشت کە ئەو خانمە ئەرکی خۆی جێبەجێ کردووە و شتی زۆری ناردوە بۆ ناوچەکە، شتەکانیش گەیشتونەتە حاجی ئۆمەران، بەڵام زۆربەی شتەکان هەر لە ئۆردوگاکان بە کەڵەکەکراوی ماونەتەوە و نەگەیشتونەتە دەستی خەڵکەکە. لە راستیدا نازانم ئەگەر هیچ شتێك لەو شتانە گەیشتبێتە دەستی خەڵکەکە، بەڵام ئەوەی دەیزانم ئەو شتانە دوای هەرەسهێنانی بزوتنەوەکە لە نەغەدە زۆربەیان هەرزانفرۆش کران لە ١٩٧٥دا. بەتایبەتی پەتووەکان لە بازاڕی نەغەدە زۆر بازاڕیان گەرم بوو.

ئەو لیژنەیەی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان لەو رێکخراوانە بون کە لە سویسرا بونیان هەیەو تەرخانن بە کاروباری پەنابەران سەردانی هەندێك کامپی ئاوارەکانیان کردو و داوایان لێکردین لە کامپی زێوە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکەین. منیش لە کاتی خۆیدا گەیشتمە کامپی زێوە، دوای ئەوەی داوام کرد لەیەکێك لەوانەی بە زمانی فەرەنسی قسە دەکەن کە قسەکان وەربگێڕێتە سەر زمانی فەرەنسی.

مەسەلەکەش پەیوەست بوو بەو ئاگادارکردنەوانەی کە دەمنارد بۆ سەرکردایەتی سەبارەت بە ئەگەری رێکەوتنێکی ئێرانی/ عیراقی لە ئاییندەیەکی نزیکدا. لەبەر ئەوەش من وەك سەرۆکی لیژنەی ئاوارەکان ئەرکم بوو هەوڵ بدەم هەلومەرجێکی باش بۆ ئاوارەکان دەستەبەر بکەم و ئایندەییان مسۆگەر بکەم.

لێرەوە بیرۆکەی ئەوەمان بۆ هات کە نەتەوە یەکگرتوەکان و رێکخراوەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان بەشدار بن لە بەڕێوەبردنی کامپەکان، ئەویش لە رێگەی ئامادەبوونی بەردەوامیانەوە لە نێو کامپەکاندا.

بێگومان دەمانزانی ئێران ئەم جۆرە رێوشوێنانەی بە دڵ نابێت چونکە ئەو دەیویست تەنها خۆی بزوتنەوەی کورد بە شێوەیەکی رەها کۆنترۆڵ بکات.

هەر لەبەر ئەو راستیەش بوو دەمانویست ئێمەش لەگەڵ نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان دیدار و کۆبونەوە بە تەنیا بکەین بۆ ئەوەی ئەم بابەتە بە راشکاوی باس بکەین، هەر بۆیە وەرگێڕەکەم داوای لێ کردن ئەگەر بۆ چەند خولەکێکیش بوایە دیدار لەو شێوەیە رێك بخەین لە کامپێکی دورە دەستدا. بەڵام پێش ئەوەی ئێمە دەست بکەین بە قسە هەندێك بەرپرسی ئێرانی خۆیان کرد بە ژووردا گوتیان: ئەوە دۆزیماننەوە!

گوتم: فەرموون ئێوەش دابنیشن لەگەڵمان. ئیدی دەستم کرد بە قسەکردن وەك ئەوەی شتێکی نائاسایی رووی نەدابێت. بێگومان من نەمدەویست ئەم دەرفەتەم لە دەست بچێت ئەگەر پەناشم بردبێت بۆ شێوازێکی تر لە قسەکردنم بە گوێرەی توانا، واتە هەمان بیرۆکەی خۆم بگەیەنم بە لە بەرچاوگرتنی ئامادەبوونی ئێرانییەکان لەبەر ئەوە دەستم کرد بە باسی رەوشی ئاوارەکان و هەوڵەکانی ئێران بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاریی باش بۆیان. ئەمەش خۆی تا ئەو ساتە وەختە راستیەکی حاشا هەڵنەگر بوو، بۆیە پرسیارم لە شاندەکە کرد: بۆچی نەتەوە یەککگرتوەکانیش بە ئەرکی خۆی هەڵناسێت و هەندێك چاودێر بنێرێت و بەشداری بکات لەو ئەرکە گرانەدا کە بە تەنیا خراوەتە سەرشانی ئێران؟!

لێرەدا ئەندامانی شاندی نەتەوە یەککگرتووەکان هەر یەکەیان سەیری ئەوی تری دەکرد، وەك ئەوەی پێشبینیی دەستپێشخەرییەکی لەو شێوەیەیان نەکردبێت و هەر یەکێکیان چاوەڕێ بوو ئەوی تر وەڵام بداتەوە. سەبارەت بە ئێرانیەکان، هەستم کرد ئەوان خۆشحاڵ بوون بەو ستایشەی کردمن، بەڵام نازانم، ئایا ئەوان هیچ گومانێکیان پەیدا کردبوو سەبارەت بە پاڵنەرەکانی من بۆ ئەو دەستپێشخەرییەی بە ئامادەبوونی ئەوانن خستمە بەردەم شاندی نەتەوە یەککگرتوەکان.

بەڵام لە راستیدا نە لە کاتی کۆبونەوەکەو نە دوای کۆبونەوەکە هیچ وەڵامێکم لە شاندەکە وەرنەگرت.

من یەقینم هەیە کە ئەگەر هەندێك نوێنەری نەتەوە یەککگرتوەکان لە کامپەکانی ئاوارەکاندا هەبوونایە لە ناو خاکی ئێران، دەیانتوانی بۆ نمونە رێ

بگرن لەوەی لە لایەن هەندێك سەربازی ئێرانیەوە تەقە بکرێت لە هەندێك پێشمەرگەی ئاوارە لە دوای شکستی ١٩٧٥ لە کامپی کرماشان.

دیداری سێهەمم لەگەڵ نێردراوێك بوو کە ئێستا ناوەکەیم بیر نەماوە، بەڵام وا دەردەکەوت کە ئەفسەرێکی خانەنشینی سوپا بێت، چونکە بە زۆری جەختی دەکردەوە لەسەر رەوشی جەنگاوەرەکان و چۆنێتی دەستەبەر کردنی جلوبەرگ بۆیان لە بەرەکانی جەنگ و باسی ئەوەی دەکرد کە جلوبەرگی گرانبەهای نوێ بکڕن. من لەو باوەڕەدام کە دەبوو ئەو نێردراوە لەگەڵ نوێنەرێکی نوسینگەی سەربازیی بزوتنەوەی کورد بێت. بەهەر حاڵ من سوپاسم کرد لەسەر هەر هاوکارییەك بکات بە دەست بزوتنەوەکە بەڵام دوای ئەوە نەمزانی چیی بەسەر هات.

## ئەزمونێك لەگەڵ لاوانی بێکار لە ناو کامپەکاندا

لە رێی ئەو سەردانانەی ئەنجامم دەدا بۆ کامپەکان، دەرکەوت کە دیاردەی بێکاری لە ناو خەڵکەکەدا بڵاوە، بۆیە هەوڵماندا میکانیزمێکی گونجاو و ئەرێنی و پەروەردەیی بدۆزینەوە بۆ پڕکردنەوەی کاتی بەفیڕۆ چووی ئەو گەنجانە. پێشنیارێکم کرد بۆ بەرپرسانی ئێرانی تاکوو وەرشەی چاککردنەوەی ئۆتۆمۆبێلیان بۆ بکەینەوە، بۆ ئەوەی ئاوارەکان فێری کاری میکانیکی ببن. تا ئەو کاتەی پێشنیاری تر دەبینینەوە، بۆیە سەرخستنی ئەم پێشنیارە بەلای منەوە زۆر گرنگ بوو، بەڵام بەلامەوە سەیر بوو کە ئێرانییەکان زۆر بە خێرایی بەدەم داواکاریەکەمەوە هاتن. لە ماوەیەکی کەمدا هۆڵێکی گەورە و بەرز لە کامپی زێوە کرایەوە. چەندین ئامێری فێرکردن کە لە ناوەڕاستدا بڕابوونەوە بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانی شرۆڤەی بکەن، هێنرانە هۆڵەکەوە، ئینجا کادری فێرکردنی ئێرانیش هێنرابوون، بەم شێوەیە هەموو پێداویستیەکانی سەرکەوتنی پرۆژەکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو.

بەڵام ئەوەی من لەبەر چاوم نەگرتبوو هەڵوێستی ئاوارەکان بوو چونکە ئاوارەکان کامپی زێوە ئەو دەستپێشخەریەی ئێرانیان رەتکردەوە. دوای ئەوەی ئامێرەکان برانە هۆڵەکەوە بۆ فێربوون، نزیکترین دەرفەتیان قۆستەوە

بۆ ئەوەی لە هۆڵەکە هەڵبێن و کادرە ئێرانییەکەیان بە واقورماوی بەجێ هێشت کادیرە ئێرانیەکان نەیاندەزانی چی بکەن بۆ ئەوەی بڕوا بەو بێکارانە بێنن سود لەو دەرفەتە وەربگرن. ئاوارەکان لەجیاتی ئەوەی بچنە هۆڵەکە و فێری شتێکی باش ببن لە دەرەوەی هۆڵەکە دادەنیشتن و کاتیان بە دامەکردنەوە دەکوشت کە هیچ سودێکی تێدا نیە، وەك ئەوەی بە ئەنقەست گاڵتە بەهەر شتێکی باش بکەن.

لە راستیدا ئەم ئەزموونە نێگەتیڤە رێگرم بوو لەوە هیچ پێشنیارێکی تر پێشکەش بکەم بە ئێرانییەکان وەك ئەوەی فێری دارتاشییان بکەن بۆ نموونە. بەراستی تا ئێستاش کە ئەم ئەزموونەم بیر دەکەوێتەوە هەست بە شەرمەزاری دەکەم لە ئاست دەستکراوەیی ئێرانیەکان و ئەو نەفامیە سەیرەی ئاوارەکان دەریانخست سەبارەت بە ئایندەی خۆیان.

## چەند پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو

لە کاتێکدا ئێمە سەرقاڵی ئەوە بووین باری ژیانی ئاوارەکان باشتر بکەین و هەموو توانای خۆمان لەو بوارەدا بەگەڕ خستبوو، لەو رووەشەوە دەستکەوتی باشمان هەبوو: ئاسایش بەرقەرار بوو، خواردن زۆر بوو، چاودێریی تەندروستی باش بوو، دارایی گشتی پارێزراو بوو، ...هتد لەو کاتەدا گەشتێکم کرد بۆ ناوچە ئازادکراوەکان لە رێگەی حاجی ئۆمەرانەوە، لە خاڵی پشکنینی سەر بە ئێران بەرگوێم کەوت کەسێکی تر لەوبەرەوە بانگی من دەکات، بینیم سەعید مەسیفی بوو، ئەو بەڕێوەبەری گرتووخانەی بزوتنەوەی کوردایەتی بوو لەو ماوەیەدا. من لەوەو پێش ئەوم دەناسی، ئەو بە دەنگی بەرز هاواری کرد کاك: عەبدولمسەور، ئاگامان لەو ئیمپراتۆریەتە هەیە کە لەو دیو سنوور داتمەزراندوە. ئینجا بە دەم پێکەنینێکی بەرزەوە چوە ناو سنووری ئێرانەوە.

لە راستیدا لەو کاتەدا و دوای چەند هەفتەیەکیش هیچ بایەخێکم بەو قسەیە نەدا، بەڵکوو قسەکەم وەك گاڵتەیەکی قورس وەرگرت و ئیدی خەریکی کارەکانی خۆم بووم، بۆ ئەوەی ویژدانی خۆم رازی بکەم. بەڵام دوای ماوەیەك کاتێك لە کامپی دیزەفول دەگەڕامەوە، بینیم یەکێك لە بارزانیەکان کە لە لایەن

ئیدریسەوە رەوانە کرابوو چاوەڕێم دەکات، ئەو پێی گوتم: بەڕێزم، ئیدریس داوای کردوە هەر لەگەڵ پێگەیشتنی ئەم هەواڵە بڕۆیت بۆ حاجی ئۆمەران، هەمو شتێك جێ بێڵەو دەستبەجێ وەرە بۆ ئەوێ.

بێگومان لە درەنگە شەودا بیرم لەوە دەکردەوە: بڵێی ئیدریس چی بوێت؟

ئینجا لەبەر خۆمەوە گوتم: باشە. با بڕۆین بۆ حاجی ئۆمەران و بزانین چیە.

درەنگە شەو گەیشتینە ماڵی سەرکردەی بزوتنەوەی کوردی و لە راستیشدا من زۆر ماندو بووم. پرسیارم کرد لە بارەی شوێنی ئیدریسەوە ئەوانیش ئیشارەتیان کرد بۆ ژوری پاسەوانەکان کە دەکەوتە خوارووی ماڵەکەوە.

کاتێك چوومە ژورەوە بۆ یەکەم جار بینیم ژورێکی بچوك بوو کەلوپەلی ناو ژورەکە سادە بوو، ئەوانەی لەوێ بوون: ئیدریس و مەسعود و عەبولموئمین و عەلی خەلیل بوون.

پاش سڵاو کردن بە گاڵتەوە گوتم: خێربێت. من ئێستا لە کامپی دیزەفول گەڕاومەتەوە، بەڵام پەلەتان چی بوو. من بە دەم قسەوە زەردەخەنەم دەهات.

ئیدریس دەستیکرد بە قسەکردن: دەسەڵاتدارانی ئێران لێت رازی نین، ئەگەر بگەڕێتەوە ئەو دویو دەتگرن، بۆیە دەبێت دەست لەکار بکێشیتەوە و کارێکی تر بکەیت.

من گوتم: ئەم هەواڵە راست نیە، ئێستا بە چەندین خاڵی پشکنیندا تێپەڕیوم، لە دیزەفولەوە بۆ شنۆ و لەوێشەوە بۆ حاجی ئۆمەران، و هیچ گرفتێکم نەهاتۆتە رێ.

سەیری مەسعودم کرد تا بزانم رای ئەو چی دەبێت، بینیم ئەو سەری داخستوەو تەنیا گوێ دەگرێت و هیچ ناڵێت، وەك ئەوەی بڵێ: ئەم بابەتە پەیوەندیی بە منەوە نیە، هەر بە راست بیرم نایەت هیچی وتبێت لەو دانیشتنە.

دوای ئەو سەیری عەبدولموئمینی برام کرد وام هەستکرد چاوەکانی فرمێسکی تێزاون، ویستم بارەکەی لەسەرشان سوك بکەم گوتم: گوێ مەدەرێ برام، لێگەڕێ با خۆم بەرەو روویان ببمەوە، تۆ گوێ مەدەرێ. عەلی خەلیلیش تەنیا گوێگر بوو هیچی تر.

ئینجا روم کردەوە ئیدریس گوتم: تۆ دەزانیت من باوەڕم بەو قسەیە نیە و هیچیش راست نیە، بەڵام با بە راشکاوی قسە بکەین. ئێوە دەتانەوێت من

بەردەوام نەبم لەم کارەدا. ئەوە هەموو شتێکەو تەواو. قسەکانی تر هەمووی بیانوی بێبەنەمان. گرفتەکەش لەوەدایە کە من پێویستم بە پیشتیوانیی ئێوەش هەیە وەك چۆن پێویستم بە کۆمەکی ئێرانیەکانیش هەیە، ئەگەر نا گرفتەکان زۆر ئالۆز دەبن. لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی کێشە دروست نەکەین، بەهۆی ئەوەی ئێوە پشتم بەردەدەن، دەبێت چارەسەرێکی تر بدۆزینەوە، ئێوە چ چارەسەرێك پێشنیار دەکەن؟

گوتی: کاری تر زۆرن، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ ئەفسەریت، وا باشترە بگوێزرێیتەوە بۆ مەکتەبی عەسکەری.

گوتم: گرفت نیە بەڵام بە چ سیفەتێك و بە چ ناونیشانێك؟

ئیدریس گوتی: لە مەکتەبی عەسکەری ژورێکی بچوك هەیە لەوێ حەوت نەخشەی تێدایە لە یەکەوە بۆ حەوت ژمارەیان لێدراوە. تۆ بەرپرسی ئەو ژورە دەبیت.

پرسیمەوە: لە لایەنی پراکتیکیەوە ئەو قسەیە چ مانەیەك دەگەیەنێت؟

ئیدریس گوتی: هەر کاتێك ئەندامانی مەکتەبی عەسکەری کۆبوونەوە، ئەرکی تۆ ئەوەیە کە ئەو نەخشەیە ئامادە بکەیت کە داوای دەکەن و بەدەست ئاماژەی بۆ چۆنێتی کردنەوە و داخستنەوەی نەخشەکان کرد لەسەر مێزێك، ئینجا شتێك لەسەر مێزەکە دادەنێیت و پاشان دەچیتە دەرەوە تا کۆبونەوەکە تەواو دەبێت. دوای ئەوە جارێکی تر نەخشەکە دەپێچیتەوە و دەیبەیتەوە شوێنەکەی خۆی. ئەمە هەموو شتێکە!

لە راستیدا من ئامادە نەبووم ئەو گاڵتەجاریە پەسەند بکەم ئەگەر بۆ ساتێکیش بێت بۆیە دەستبەجێ وەڵامم دایەوە: ئیدریس تۆ دەزانیت ئەم کارە چەند مەترسیدارە منیش شایستەی ئەو بەرپرسیارێتیە گەورەیە نیم، جا بۆ ئەوەی هیچ لایەکمان ئیحراج نەبین، دەبێت بگەڕێین بە شوێن کەسێکی باشتردا بۆ ئەوەی ئەو ئەرکە ئالۆزە رابپەڕێنێت، بەڵام ئێوە دەزانن باوکتان پێش ئەوەی بێمە ناو بزوتنەوەکەوە بەڵێنی پێدابووم بمنێرێت بۆ دەرەوەی وڵات بۆ تەواو کردنی خوێندنەکەم، بەڵکوو گەورەیی بنوێنن و سۆراخی ئەو بەڵێنەم بۆ بکەن.

ئیدریس بۆ یەك ساتیش دودڵ نەبوو، چونکە دەیویست لەو کارەم دورم بخاتەوە بۆیە گوتی: ئێمە ئەو بەڵێنە بەجێ دەگەیەنین. گوتم: کەواتە مەسەلەکە کۆتایی پێ هات، من دەست لە سەرۆکایەتیی لیژنەی پەنابەران دەکێشمەوە و چاوەڕێی تەواوکردنی مامەڵەی خوێندن دەکەم بەڵام پێم باشە لە نەغەدە چاوەڕێ بکەم لای خێزانەکەم.

ئیدریس بۆ کۆتاییهێنان بەم مەسەلەیە گوتی: دەتوانیت بڕۆیت بۆ نەغەدە و لەوێ چاوەڕوان بکەیت تا چارەسەرێکت بۆ دەدۆزینەوە.

منیش بە خێرایی وەڵامم دایەوە: بەڵام تۆ تۆزێك پێش ئێستا گوتت ئەگەر بچیت بۆ ئێران دەستگیر دەکرێیت. ئیدریس بێدەنگ بوو. لێرەدا پرسەکە کۆتایی پێهات. لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و گەڕامەوە بۆ شنۆ بۆ لای بارەگای لیژنەی پەنابەران و لەوێ هەواڵەکەم بە کورتی پێگەیاندن بێ ئەوەی وردەکاری باس بکەم، ئینجا هەندێك پارەم لە هاوڕێیەکم بە قەرز وەرگرت تاکوو پێی بگەمە شنۆ دوای ئەوە بەخێرایی بۆم گێڕایەوە، دوای دەستلەکارکێشانەوەم هەموو هاوڕێکانیشم لە لیژنەکە دەرکران و خەڵکانی تریان لە جێگە دانان، لە راستیدا ئەم کارە کودەتایەکی رێکخراو بوو.

## نەغەدە: چاوەڕوانیەکی بێسوود

ماوەیەك لە نەغەدە مامەوە. من لەو ماوەیەدا چاوەڕێ بووم هەواڵێکم پێ بگات سەبارەت بە خوێندنەکەم.

لەو ماوەیەدا ئەفسەرێکی سەر بە هەواڵگریی ئێران لە لایەن تیمسار سەیادیانەوە سەردانی کردم، ئەو داوای کردبوو کە بگەڕێمەوە بۆ سەرۆکایەتیکردنی لیژنەی کاروباری پەنابەران وەك پێشوو. لە راستیدا هەندێك دوودڵ بووم لە شێوازی چۆنێتی داڕشتنی وەڵامێکی گونجاو بۆ ئەو داواکاریە توشی سەرسوڕمان ببوم بەڵام ویستم مەسەلەکە پینە بکەم گوتم: هیوادارم سڵاوی گەرمم بە ئاغای تیمسار سەیادیان بگەیەنیت و لە بری من سوپاسی بکەیت کە بە باشی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردوین لەو ماوەیەی کەمن دەستبەکار بووم لە سەرۆکایەتی لیژنەی کاروباری پەنابەران، بەڵام هیوادارم لەوە تێ بگات

کە من خزمەتی سەرۆکی بزوتنەوەی کوردایەتی دەکەم، ئەویش بڕیاری داوە لە نەغەدە چاوەڕوان بم تا کاتی گەشتکردنم دێت بۆ دەرەوەی وڵات بۆ ئەوەی کارێکی تر بگرمە دەست.

هەروەها داوام لە نێردراوەکەی سەیادیان کرد سڵاوی من بگەیەنێت بە هەموو هاوڕێکانی سەبارەت بە هاوکاریی باشیان لەگەڵماندا بە درێژایی ئەو ماوەیە. لێرەدا دەمەوێت ئەوە دوبارە بکەمەوە کە هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی ئێران بە پلەی ٩٠٪ پۆزەتیڤ بوو، بەڵام هەڵوێستی دواییان، واتە دوای هەرەسهێنانی بزوتنەوەی کوردایەتی، هیچ زانیاریەکم لا نیە سەبارەت بە رەوشی پەنابەران بە شێوەیەك بتوانم بڕیاری لەسەر بدەم، بەڵکوو ئەوەیان پەیوەستە بەو ماوەیەی کە من شنۆم بەجێ هێشت و ئەم گروپە تازەیە دەستبەکار بوون.

لە ماوەی چاوەڕوانیمدا شێخ سلێمان بارزانی داوای لێکردم بە ناو پێدەشتەکانی نەغەدەدا هەندێك پیاسە بکەین. بەپێ، ماوەیەك رۆیشتین و لە شوێنی پەنابەران دورکەوتینەوە ئینجا بێدەنگیی شکاندو رووی قسەی کردە من گوتی: عەبدولمسەور وا نەزانیت تۆ هەڵەیەکت کردوە بۆیە ئەم حاڵەتەت بەسەردا هاتوە، تۆ لە راستیدا هیچ هەڵیەکت نەکردوە، بەڵام مەسەلەکە لە متمانە کردندایە و ئەوانە متمانەیان بە تۆ نیە. ئەوە هەموو شتەکەیە، هیچ شتێکی تر نیە، تێگەیشتیت؟ هەندێك لە ئەندامانی خێزانەکەم هەواڵیان پێگەیاندم کە هەندێك کەس چونەتە لای سلێمان بارزانی و بە باش باسی منیان کردوە لە کاتی دەستبەکاربووم لە کاروباری پەنابەران. ئەویش گوتبووی: کێ لەو باوەڕەدا بوو ئەو گەنجە بتوانێت ئەو هەموو کارە بەباشی بەڕێوە بەرێت؟

رۆژێکی تریش کە لە نەغەدە بووم، شێخ سلێمان بارزانی داوای لێکردم لەگەڵیدا برۆم بۆ حاجی ئۆمەران. لەو گەشتەمەدا چاوپێکەوتنی دوەم و دوا چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەرکردەی بزوتنەوەکەدا مەلا مستەفا ئەنجامدا.

لەو ژورەدا لە حاجی ئۆمەران کە پڕ بوو لە میوان، بەڵام لە پڕ بە هۆی شتێکەوە کە نەمزانی چیە خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کردو من بەتەنیا لەگەڵ بارزانی مامەوە. کەلوپەلی ناو ژورەکە زۆر سادە بوو و هیچ شتێکی وای تیا نەبوو ئاماژە بێت بۆ ژیانی خۆشگوزەرانی، یان زێدەڕۆیی، بەڵکوو بە دووری

نازانم ئەو شتانەش کە لە ژورەکەدا بوون هەر بۆ ئەوە بوو هەندێك شوێن بۆ میوانەکان دەستەبەر بکەن.

مەلا مستەفا دەستی کرد بە گێڕانەوەی چەند روداوێکی پێشوو کە خۆی تێدا ژیابوو، ئنجا پرسی: عەبدولمسەور ئەو ژورەت بینیوە کە هەندێك مەلا ویستیان منی تێدا بکوژن؟ گوتم: بەڵێ، دوای روداوەکە چومە ژورەکە.

ئینجا گوتی: عەبدولمسەور ئەوە سەبارەت بە شەڕی فلان (ناوی شەڕەکەی برد بەڵام بیرم چۆتەوە) لەو شەڕەدا فڕۆکەی بریتانی لەگەڵ سوپای عیراق بەشدار بوون. لەکاتی هێرشدا بۆ سەر سەنگەرەکانمان، فڕۆکەکان زۆر بە چڕی بۆمبارانیان دەکردین، ئەو بۆمبانە ناوچەکەیان کردبوە دۆزەخ، بەڵام ئەگەر ئەجەل نەهات ، نامریت. ئەو جارەش دەرباز بووم.

لە بابەتێکی تردا باسی ناکۆکیەکانی کرد لەگەڵ شێخ عوسماندا گوتی: هەر کاتێك دەچوم بۆ بینینی، ناخۆشیی دروست دەکرد بۆمان، ئەو دەتۆقی و ترسێکی زۆری لێ دەنیشت، هەندێك شتی تری باس کرد کە پێویست ناکات لێرە باسیان بکەم.

لە ناکاو ئیدریس خۆی کرد بە ژووردا و ناڕەحەتیی پێوە دیاربوو و دوور لە من دانیشت، بەڵام باوکی هەر بە سۆزی باوکایەتی پێی گوت: ئیدریس، کوڕم ئیشێکت نیە ئەمڕۆ بیکەیت، ئیتر بۆچی لێرە دادەنیشیت؟ ئیدریس بۆڵەبۆڵێکی کرد تێی نەگەیشتم، وەك بیانوویەك وابوو بۆ مانەوەی لە ژورەکەدا. پاش ماوەیەکی تر ئەمجارەیان باوکی تۆزێك زبرتر هەمان پرسیاری لێکردەوە، ئیدریسیش بە هەمان شێوە قسەیەکی تر کە من تێی نەگەیشتم وەڵامی دایەوە دوای ماوەیەکی تر بۆ جاری سێهەم باوکی بە زبری پێی گوت: پێم گوتی: ئیشت نیە بیکەیت، چی دەکەیت لێرە دانیشتوویت؟

ئەمجارەیان دیار بوو وتەکانی باوکی نیشانەی توڕەیی بوون لە ئیدریس بۆیە بەخێرایی لە ژورەکە دەرپەڕی.

بە راستی ئەگەر من بومایە لە جیاتی ئیدریس هەر لە سەرەتاوە هۆی هاتنەکەم بۆ باوکم روون دەکردەوە، یان هەر دەستبەجێ ژورەکەم جی دەهێشت بە ئەدەبەوە، بەڵام ئیدریس هیچیانی نەکرد! من لەو باوەڕەدام کە

ئیدریس لەوە دەترسا کە لای باوکی سکاڵای لەسەر بکەم بەهۆی ئەوەی لە کاروباری پەنابەران بێ هۆ دوری خستومەتەوە.

پاش دەرچوونی ئیدریس. بۆ ماوەیەك ژورەکە کپ بوو، ئینجا مەلا مستەفا رووی تێکردم گوتی: عەبدولمسەور دەزانیت من کێم؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: من کوڕی شێخ محەمەدی بارزانیم. بەڵام ئەو پێگە بەرزەم وای لێ نەکردوم لە کاتی تەنگانەدا ئیش نەکەم بۆ بژێووی خێزانەکەم. من کاری دەستیم کردوە. کاتێك کۆچمان کرد بۆ تورکیا هیچمان نەبوو بیخۆین، بۆیە ناچار بووم کار بکەم تاکوو پاروویەك نان بۆ خێزانەکەم پەیدا بکەم.

ئینجا بەردەوام بوو لە قسەو گوتی: عەبدولمسەور ئەگەر باوەڕت بە شتێك هەبوو دەبێت لەسەری سور بیت و لە پێناویدا قوربانی بدەیت، ئینجا هیچ نەنگییەك نیە لەوەدا کە هەوڵ بدەیت بژێوی رۆژانەی خۆت پەیدا بکەیت. ئیشکردن هەرگیز نەنگی نیە.

ئەمە دواجار بوو چاوم پێ کەوت لە نزیکەوە، چونکە دوای شکستی بزوتنەوەی کوردایەتی ئیدی هەر یەکەمان بە لایەکدا پەرت و بڵاو بووینەوە. ئەو لە ئەمریکا سەری نایەوەو من تاکە کەسێك بووم لە بنەماڵەی بارزانی کە پێش ئەو دیدارە بە چەندین ساڵ هیچ دودڵ نەبووم لە ئیشکردن وەك کرێکار بۆ ئەوەی خوێندنەکەم تەواو بکەم. دەرەنجامیش ئەوە بوو من لە ناو بنەماڵەی بارزانی یەکەم کەس بووم خوێندنی زانکۆم تەواو کرد و یەکەم کەسیش بووم دکتۆرام بەدەستهێنا.

# هەرەس هێنانی شۆڕش

لە نەغەدە لەکاتی چاوەڕوانیمدا، بیستم مەسعود هاتوە بۆ ئەوێ بۆ سەردانی خێزانەکەی، منیش بڕیارم دا پەیوەندیی پێوە بکەم، بە پلەی یەکەم بۆ ئەوەی بابەتی خوێندنەکەم باس بکەم لەگەڵیدا ئەویش لەو ڕووەوە کە دەڵێن (بیرخستنەوە لەوانەیە باش بێت).

لەو دیدارەدا باسی خوێندنەکەم لەگەڵدا کرد، ئەویش گوتی بە شوێن مەسەلەکەوەن و بەو شێوەیە بە کورتی دەرگای قسەی داخست. لێرەدا بۆ دوا جار پرسیاری ئەگەری ڕێککەوتنێکی ئێران- عیراقیم لێ کرد، مەسعود ماوەیەك بێدەنگ بوو نیشانەی ناڕەحەتیی پێوە دیار بوو، ئینجا ئاوڕی لێدامەوە گوتی: عەبدولمسەور تۆ ماندوو نابیت لەم پرسیارە لە من یان لە ئیدریس؟ بەڵام ئەگەر ئەوەی من دەیزانم تۆ بیزانیت، هەرگیز ئەو پرسیارەت نەدەکرد. من گوتم: ئایا دەتوانیت هەندێك قسەم بۆ ڕوون بکەیتەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بم؟

مەسعود گوتی: ئێمە پەیوەندیمان تەنیا لەگەڵ وڵاتە بچوکەکانی وەك ئێران نیە، بەڵکوو پەیوەندیمان لەگەڵ وڵاتە گەورەکانیش هەیە.

بێگومان ئاشکرا بوو کە ئەو مەبەستی لە ئەمریکایە. بۆیە پێویستی نەدەکرد ناوی بێنین، بەڵام دیسان پرسیارم کردەوە: ئایا تۆ لە هەڵوێستی ئەوان دڵنیایت؟

مەسعود وەڵامی دامەوە: بەڵێ.

منیش گوتم: لێرە بەدوا هەرگیز ئەو پرسیارە ناکەمەوە.

بەڵام بۆ نەگبەتی، ئێمە قسەکانمان تەواو نەکردبوو لە دەرگا درا و بارزانییەك خۆی کرد بەژووردا و ئارەقی لێ دەچۆڕا، وەك ئەوەی بە ڕاکردن هاتبێت بۆ ئەوەی هەواڵێکی گرنگی پێ بڵێت و بێ پێشەکی گوتی: گەورەم ئەمە نامەیەکە لە ئیدریسەوە، دەڵێت دەبێت پێش هەر شتێك یان پێش ئەوەی بچیت بۆ لای هەر لایەنێك ئەم نامەیە بخوێنێتەوە.

مەسعود نامەکەی بە چەقۆیەك کردەوە و جار جارە بە گاڵتەوە قسەکانی کابرای هەڵگری نامەی دەوتەوە: هیچ شتێك نەکەیت، نەچیت بۆ هیچ شوێنێك.

مەسعود دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکە و لە ناکاو نیشانەی گاڵتەکردن لە نێوچەوانیدا نەما، دوای چەند ساتێك نامەکە لە دەستی کەوتە خوار و جارجارێك سەیری منی دەکرد و بیری دەکردەوە گوتی: تۆ هۆکاری ئەم شتەیەت، هەر دەتپرسی رێکدەکەون، ئەوەتا بە راستی رێککەوتون.

گوتم: ئەی ئێستا چی دەکەن؟

گوتی: "هیچ. نامەکەی ئیدریس باسی ئەوە دەکات کە ئێران لە ئێستادا تۆپخانە و دژە فرۆکەو یەکە سەربازیەکانی دەکێشێتەوە، ئیدی ناتوانین هیچ شتێك بکەین".

لە راستیدا من بە درێژایی کاتەکە دڵنیا بووم چونکە بە راستی ئەرکەکانی سەرشانی خۆم بەجێ هێنابوو.

من لەو باوەڕەدام نهێنی سەرکەوتن لە کاردا ئەوەیە کە بە دڵسۆزی و گەرم و گوڕییەوە بەجێی بێنێت گەرم و گوڕی لەکاردا هەمیشە دەبێتە هۆی سەرکەوتن. ساڵی ۲۰۰۷ هاوڕێم شەمسەدین موفتیم لە هەولێر بینی بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەو گوتی: ئەرکت ئەوە بوە کە هەواڵ بدەیت ئەگەر نا ئەوە دەبووە ناپاکی.

لە سەرەتادا بزوتنەوەی کورد بڕیاریدا بەردەوام بێت لە شەڕکردن. من چووم بۆ حاجی ئۆمەران و ئیدریس و مەسعودم بینی. پێم گوتن من ئامادەم هەر ئەرکێك بگرمە ئەستۆ لە بەرەکانی جەنگ. ئەوان بەم قسەیەی من دڵخۆش بوون. منیش دڵنیام کردنەوە لەوەی ئەم بڕیارە لەم کاتەدا بڕیارێکی دروستە.

بەڵام دوای ئەوە بڕیارێکی پێچەوانە دەرچوو، کە چیتر بەردەوامی بە شەڕ نادەن، و خەڵکیشیان سەرپشكِ کرد لەوەی پەنا بەرن بۆ ئێران یان بگەڕێینەوە بۆ عیراق و چەکەکانیشیان رادەست بکەنەوە.

دیسان سەردانی ئیدریس و مەسعودم کرد لە ماڵی مەلا مستەفا لە حاجی ئۆمەران و ئەمجارەیان لەگەڵیان ناکۆك بووم. ئەوانم لە ژووری پێشوازیکردن

بینی و دەستمکرد بە قسە کردن و هەوڵمدا تێیان بگەیەنم کە ئەم بڕیارەی دوایی هەڵەیە، بە پێچەوانەی بڕیارەکەی پێشوو وا باشە چاوی پێدا بگێڕنەوە و شەڕ بەردەوام بێت چونکە بەردەوامیی شەڕ پێویستە و هیچ جێگرەوەیەکی نیە.

لێرەدا ئیدریس وەڵامی دایەوە: نازانیت چەند کوژراوو بریندارمان هەیە. من گوتم: دوژمنیش کوژراوو برینداری هەیە. ئەمە شەڕە.

ئیدریس گوتی: زەخیرەی هەموو جەبهەکان کەم بۆتەوە و بریندارمان هەیە و پێویستیان بە چارەسەرە. من وەڵامم دایەوە: بێگومان بەرامبەریش هەمان دەردی هەیە. بەرگریکردن لە ئێستادا پێویستە و هەر ئەوەش سەرکەوتن مسۆگەر دەکات. ئەو لایەنەی باوەڕی بە پرسەکەی هەبێت، لە کۆتاییدا سەرکەوتوو دەبێت.

بەڵام درێژەدان بە گفتوگۆ لەگەڵ هەردو برا قورس بوو چونکە هەردوکیان لە کاتی قسەکردندا دەستیان دەکرد بە گریان. ئەوان سور بوون لەسەر ئەوەی درێژەدان بە شەڕ ئەستەمە.

لەو کاتەدا لە دەرگا دراو حەسۆ میرخان ئامر هێزی پشدەر هاتە ژوورەوە، ئیدریس پێی گوت: حەسۆ عەبدولمسەوور سورە لەسەر ئەوەی درێژە دان بە شەڕ راستترە و دەبێت بەردەوام بین. بەڵام ئێمە پێمانوایە ئەو شەڕە ئەستەمە. ئەی تۆ دەڵێی چی؟

حەسۆ میرخان- ئامر هێزی پشدەر- بێ هەڵوەستەکردن گوتی: عەبدولمسەوور راست دەکات، درێژەدان بە جەنگ پێویستە و شیاویشە.

ئیدریس بە گاڵتەوە گوتی: حەسۆ وا باشتر بوو نەیەیتە ژورەوە، تۆ پشتی عەبدولمسەور دەگریت و دژی ئێمە رادەوەستیتەوە.

حەسۆ هەڵوێستەکەی خۆی روونکردەوە و هەوڵیدا شرۆڤەی وەزعەکە بکات کە چۆن پێشمەرگەکان زیاتر سورن لەسەر درێژە دان بە شەڕ، چونکە دەزانن گەلەکەیان خیانەتی لێ کراوە، ئینجا گوتی: لە رابوردودا بە زۆر پێشمەرگەم دەنارد بۆ بەرەکانی جەنگ، بەڵام لە ئێستادا خۆیان بە ویستی خۆیان و بە جۆش و خرۆشە دەچن، پێویستە ئێمە پشتیان بگرین بۆ درێژەدان بە جەنگ.

بەڵام ئیدریس و مەسعود سور بوون لەسەر هەڵوێستەکەی خۆیان و رەتیان کردەوە درێژە بە جەنگ بدەن، منیش بە بێ ئومێدیەوە گەڕامەوە بۆ نەغەدە.

دوای هەرەسی بزوتنەوەی کورد بەو شێوە شەرمهێنەرە، بە ماوەیەکی کورت دەرکەوت کە حکومەتی بەغدا زۆر زیاتر دەیناڵاند بەدەست کەم تفاقیەوە بە شێوەیەك کە بەراورد ناکرێت لەگەڵ کەموکورتیەکانی بزوتنەوەی کورد وەك ئەوەی ئیدریس باسی دەکرد. چونکە سەدام خۆی دانی بەوە نا کە چەکیان بەدەستەوە نەمابوو، ئەوەش واتە باری بزوتنەوەی کورد زۆر باشتر بوو لە باری حکومەتی بەغدا، ئەوەش واتە درێژەدان بە جەنگ بڕیارێکی دروست تر بوە. لێرەدا پرسیارێك بە زۆر خۆی دەسەپێنێت ئەویش ئەوەیە: ئەگەر بزوتنەوەی کورد درێژەی بە جەنگ بدایە، ئایا دەشیا بارزانییەکان دەرباز بوونایە لەو جینۆسایدەی لە کامپی قوشتەپە و کامپەکانی تر توشی بوون و هەڵەبجە و ئەنفال. ئێمە لەو باوەڕە داین کە زیانەکانی کورد زۆر کەمتر دەبوو.

ئەوە راستە کە پەیوەندییە دەرەکییەکان لە ئاستی نیازەکانی بزوتنەوەی کورددا نەبو، بەڵام ئەو پەیوەندییانە وێڕای هەموو کەموکورتیەك توانیبویان چەکی سوك وتۆپی باش بە دەست کورد بێنن بە شێوەیەك بتوانێت بۆ ماوەی ساڵێك درێژە بە جەنگ بدات و ئەگەر جەنگی پارتیزانیش بێت بۆ ئەوەی حکومەتی بەغدا شەکەت بکات، ئەوەش دوای مانگێك یان چەند هەفتەیەك حکومەتی بەغدای ناچار دەکرد بەوەی داوای دانوستاندن بکات بۆ ئەوەی خۆیشی لەو قەیرانە دەربچێت کە تێی کەوتوە، هەروەك چۆن لە رابردودا کردی بەڵام ئەو نائومێدیەی بەرۆکی سەرکردایەتیی گرتبوو، ئەو ورە روخانەی توشیان ببو، هیچ بواری ئەوەی بۆ نەهێشتبونەوە کە بەوردی بیر لە رەوشەکە بکەنەوە و هەڵی بسەنگێنن، چونکە لەوەپێش لەسەر ئەوە راهاتبوون کە بە شێوەیەکی رەها پشت بە ئێران ببەستن. لێرەوە هەرەسەکە ئەنجامی ئەو پاڵدانەوەیە بوو بە ئێرانەوە لە هەموو شتێکدا، کەواتە کلیلی کێشەکە بە دەستی ئێرانە نەك بە دەستی سەرکردایەتی کورد. لە یادمە کاتێك گەیشتمە نەمسا لە نێوان هەندێك بابەتی تردا، باسی کورد کراو ئەوان بە شێوەیەکی

سەیر لەم قسەیەدا هەموو مەسەلەکەیان کورت کردەوە: ئێران و عیراق رێککەوتن و بزوتنەوەی کورد هەرەسی هێنا.

لە نەغەدە شتێك هات بەبیرمدا، کە داوا لە شێخ سلێمان بارزانی بکەم لەگەڵ مەلا مستەفا باسی ئەوە بکات کە پێویستە شەڕ بەردەوام بێت. شێخ سلێمان رەزامەندیی لەسەر قسەکانم دەربڕی و چوو بۆ حاجی ئۆمەران و لەگەڵ سەرکردەی بزوتنەوەکە قسەی کردبوو، بەلآم بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی دەست بکەوێت، بە تورەییەوە پێم گوت: عەبدولموسەور تۆ بۆ تێناگەیت کە ئیدریس و مەسعود لەو پێگەیەدا نین بتوانن بێ رەزامەندی باوکیان بڕیارێکی لەو شێوەیە بدەن؟ دەبێت لەم رەوشە تێ بگەیت و واقیعەکە قوڵ بکەیت، ئەوە بزانیت کە ئەم بڕیارە بڕیارێکی دەستە جەمعیە و ناتوانرێت بگۆڕدرێت، دەبێت تۆش وەك ئەوانی تر قەبوڵی بکەیت.

لە نەغەدە سەربەست کەتانی سەری لێدام گوتی: دەیەوێت بچێت بۆ حاجی ئۆمەران و لەوانەیە ئیدریس و مەسعود ببینێت، جا ئەگەر شتێك هەیە با پێیان رابگەیەنم، منیش سوپاسم کردو تکام لێ کرد کە پێیان بڵێت هەموو چەکەکان رادەستی حکومەت نەکەنەوە، دەبێت هەندێکی حەشار بدەین لە چەندین شوێنی جیاواز و لێك دوور، چونکە رۆژێکی تر بزوتنەوەی کورد پێویستی بەو چەکانە دەبێت.. بەلآم سەربەست کاتێك گەڕایەوە پێی گوتم: وتویانە پێویستە عەبدولموسەور خۆی لە کاروباری ئێمە هەڵنەقورتێنێت.

لەبارەی ئەو هەرەسەوە زۆر نووسراوە. بێگومان سەرکردەی بزوتنەوەکەش ئامادە بوو هەموو بەرپرسیارێتیەك لەو بارەوە هەڵبگرێت، تەنانەت لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا گوتبووی: هیوادارم ناوم لە مێژوودا بسڕێتەوە.

لەوانەیە ئەوە هەڵسەنگاندنێکی گشتی بێت بۆ ژیانی سیاسیی ئەو. بەلآم ئایا رەوایە ئەوانی تر بێتاوان دەربچن و هیچ بەرپرسیارێتیەك لەو بارەوە هەڵنەگرن، وەك: مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری، سەرکردە سەربازیەکان.. هتد؟

لە راستیدا بەرپرسیارێتی گەورە دەکەوێتە ئەستۆی سەرکردەی بزوتنەوەکە، چونکە ئەو خاوەنی کۆتا بڕیار بوو کەسێکی تر پرکێشی ئەوەی

نەدەکرد کە قسەکانی ڕەت بکاتەوە یان بەرامبەری ڕابوەستێت، لە چوارچێوەی سیستمێکی سیاسیدا کە هیچ بەرنامەیەکی دیموکراتیی تێدانە بوو.

لێرەدا وا باشە هەڵسەنگاندنێکی شێخ ئەحمەدی بارزانی بهێنینەوە یاد کە سەبارەت بە برا بچوکەکەی مەلا مستەفا دەڵێت: مەلا مستەفا شت کەڵەکە دەکات، کەڵەکەی دەکا کەڵەکەی دەکات، بەڵام دواجار خۆی شەقێك لە هەموو ئەو شتانە هەڵدەدات کە خۆی کەڵەکەی کردبوون.

لە ڕاستیدا هەموو شارەزایەك لە بزوتنەوەی کورد دەزانێت کە کۆمەکی ئێران وردە وردە ببوە ئەو بناغەیەی کە بزوتنەوەی کورد لەسەری هەڵچنرابوو. هەر بە ڕاستیش بزوتنەوەی کورد کۆمەکی باشی وەردەگرت لە هەموو رویەکەوە. بەڵام کاتێك ئەو کۆمەکەی پێی ڕاهاتبو لێی بڕا ئیدی بە ماوەیەکی کورت کە لە مێژووی بزوتنەوە رزگاریخوازەکانی جیهاندا بێوێنە بووە، هەرەسی هێنا.

ئەوەش هیچ لە ڕاستی ناگۆڕێت کە بزوتنەوەکە هەوڵیدابوو ئەمریکا بەشدار بکات لەو هاوکێشە سیاسییەدا بۆ ئەوەی ڕێ لە ئێران بگرێت لەوەی پشتی بزوتنەوەکە بەر بدات، لە ڕاستیدا ئەمریکا هیچ مەبەستی نەبوو ئەو ڕۆڵە بگێڕێت مەگەر تەنیا بۆ ئەوە نەبێت کە هاوپەیمانەکەی خۆی، ئێران، ڕازی بکات، وەك ئەوەی لە ڕاپۆرتەکەی پایکدا هاتووە، بەڵام سادەیی سەرکردایەتی کورد وەهای کردبوو کە باوەڕی بەشتێك هەبێت کە خۆی لە بنەڕەتدا نیە، بۆیە لێرەوە دەڵێین کە هەرەسهێنان شتێکی حەتمی بوو.

### ئەفسەرانی ئازاد

دوای هەرەسهێنانی بزوتنەوەکە ڕۆیشتم بۆ تاران بۆ سەردانی پزیشکی ددان لەم ماوەیەدا ساواك ئاگاداری کردمەوە کە زەماڵەت هەیە بۆ بەلجیکا و ناوی منیش لە ریزی پێشەوەی ناوەکانە، چونکە هیچ پاڵێوراوێکی تر تا ئەو کاتە نەبوو، منیش سوپاسم کرد چونکە بیری ئەوەی هەبوە کە ناوی من لەو لیستەدا بنوسێت. بەڵام سەردانم بۆ تاران تێکەڵ بوو لەگەڵ سەردانێکی ئیدریسیشدا بۆ

تاران، سەردانەکەی ئیدریس کتوپڕ بوو، لەبەرئەوە پێکەوە گەشتمان کرد بۆ تاران، لە تاران بیستم شێخ سلێمان بارزانی پاش ئەوەی خەڵك سەر پشك کراون لە نێو گەڕانەوە بۆ عێراق یان مانەوە لە ئێران، ئەو گەڕاوەتەوە بۆ عێراق. دوایی بیستم کە شێخ سلێمان هەوڵیداوە پەیوەندیم پێوە بکات کاتێك لە تاران بووم بەڵام پێیان گوتبوو لێرە نیە، تا نەشگەڕاینەوە بۆ نەغەدە کەس باسی پەیوەندییەکەی ئەوی بۆ نەکردم!

ئیدریس بۆ ئەوە هاتبوو بۆ تاران کە چاوپێکەوتن بکات لەگەڵ سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ئێران (نوسەیری). من پێشنیارم بۆ ئیدریس کرد کە یاوەریی بکەم لەو سەردانەدا بۆ ئەوەی ورەی بەرز بکەمەوە، بەڵام ئەو قابیل نەبوو. دوای دیدارەکە ئیدریس چەندین جار بە فارسی ئەم قسەیەی لەبەر خۆیەوە دەیگوتەوە: بتەوێت یان نا! لێرەوە تیگەیشتم کە چاوپێکەوتنەکە خراپ بوە.

دوای ئەوە هەستم کرد ئیدریس گێچەڵم پێدەکات، بەڵام نەمدەزانی بۆچی! ئەو سور بوو لەسەر ئەوەی کە واز بێنم لە سەردانی پزیشکی پسپۆڕی ددان و بەوە رازی بم کەبچمە لای دان هەڵکەنێکی لاکۆڵان، لە بازاڕەکانی تاراندا، بۆ ئەوەی دانم بۆ چارەسەر بکات.

ئیدریس بە بەرچاوی ئامادەبوانەوە چەند جارێك ئەو داوایەی گوتەوە، تا وای لێ کردم وەرەز بووم لێی، من ئەوەم بیر خستەوە کەسەردانی بۆ تاران لەگەڵ ئەودا شتێکی نەخشە بۆ کێشراو نەبوە، هەروەها ئێمەش لە ناوچەیەکی شاخاوی دورە دەست ناژین. وێڕای ئەوەی من هەر راهاتووم لەسەر پزیشکی پسپۆڕ لە بەغداو هەولێر و نامەوێت ئەو بابەتە باس بکەم، بەتایبەتی چونکە دەسەڵاتدارانی ئێران تێچووی سەردانەکەم دەدەن و هیچ پەیوەندیی بەوەوەنیە. ئیتر بۆ خۆی لەو بابەتە هەڵدەقورتێنێ.

بە راستی ئیدریس بەو رەفتارەی تەواو توڕەی کردم و بێزار بووم لێی.

دوای کۆتاییهاتن بە بزوتنەوەی کورد بە ماوەیەك، کە پێم وایە تەنیا چەند هەفتەیەك دوای هەرەس بوو، لە بازاڕی نەغەدە دەگەڕامەوە بینیم مەسعود

بەتەنیا لە خێوەتێکدا دانیشتووەوە قەلەمێکی بەدەستەو یاری پێ دەکات، خۆی بانگی کردم گوتی: عەبدولمسەوور نایەیت بۆ ئێرە؟

منیش چووم بۆ لای و بینیم لەبیرکردنەوەیەکی قوڵدایە، دەستیکرد بە پرسیار کردن لە شتانێك کە من ئاگاداری نەبووم و ناشمەوێت لایەنێك بم لەو کێشانەدا.

ماوەیەك بێدەنگ بوو ئینجا گوتی: دەبوو گوێمان لە تۆ بگرتبایە و درێژەمان بە شەڕ بدایە، زۆر شەریفانەتر بوو لە جەنگدا بکوژرابینایە نەك لەم رەوشەی ئێستادا بووینایە.

منیش گوتم: مەسعود ئەوەی رۆیی رۆیی، کەس ناتوانێت زەمان بگێڕێتەوە، ئەمە تەواو، بەڵام پێم وایە ئێستاش دەرفەتی تر هەیە.

مەسعود وەك ئەوەی باوەڕ بە قسەکەم نەکات وەڵامی دامەوە: چ دەرفەتێك باس دەکەیت، هەموو شتێکی کۆتایی پێ هاتووە؟

گوتم: دەبێت درێژە بە شەڕ بدەین و سەر لە نوێ دەست پێ بکەینەوە و بەم شێوەیە دەستپێشخەری لە دەستی ئێمەدا دەبێت و دەتوانین دەسەڵاتی بەغدا توشی پەشۆکان بکەین. بەغداد وا دەزانێت هەمو شتێك کۆتایی پێهاتوە، جا ئەگەر ئێمە دەست بکەینەوە بە شەڕ بزانە ئەو هەڵوێستە چ کاریگەرییەکی دەبێت؟

ئەو گوتی: بەڵام چۆن؟ وا دەردەکەوت تا ئەو ساتەوەختەش بیری لە دەستپێکردنەوەی جوڵەی سەربازی لە ناو کوردستانی عیراق بۆ دەستپێکردنەوەی خەبات نەکردبۆوە.

گوتم: دەزانیت ژمارەی بەشداربوانی ئەفسەرانی ئازادیخواز لە شۆڕشی ١٩٥٨ دا بە سەرکردایەتیی عەبدولکەریم قاسم چەند بوون؟

گوتی: نازانم.

گوتم: چەند بۆچوونێك لەو بارەوە هەیە، هەندێك دەڵێن ژمارەی ئەو ئەفسەرانەی جێگەی متمانە بوون و لەگەڵ قاسم بوون تەنیا سی ئەفسەر بوە، بەڵام ئێمە لێرە زیاتر لە ٩٠ ئەفسەرمان هەیە. ئەویش واتە پرسی هەبوونی

کادری سەربازیی پێویستە هەر لە سەرەتاوە چارەسەر کراوە. ئینجا منیش دەتوانم لە ٢٤ کاتژمێردا زیاتر لە پێنج سەد بارزانی لەو کامپانەی دەوروبەر کۆ بکەمەوە، بەڵام بۆ ئەوەی نەوترێت جوڵانەوەکە تەنیا هی بارزانییەکانە دەبێت ٥٠٠ پێشمەرگەی تریش لە کامپی کرماشان کۆ بکەینەوە ئەوانیش لە ناوچەی سۆران، خۆ ئەگەر ئێوە پشتیوانیی ئەم جوڵانەوەیە بکەن لە هەموو رویەکەوە ئەوە بە ئاسانی دەتوانین جێبەجێی بکەین.

مەسعود گوتی: ئەگەر پشتت بگرین دەتوانیت ئەم کارە بکەیت؟

گوتم: بەڵی.

ئەویش گوتی: کەواتە دەست پێ بکەو ئێمەش پشتیوانیت دەکەین.

چەند رۆژێکی کەم رۆیشتبوو توانیمان ئەفسەرانێکی زۆر لە مهاباد کۆ بکەینەوە هەمویان سوێندیان بە قورئان خوارد کە بگەڕێنەوە بۆ کوردستان بۆ درێژە دان بە شۆڕش بەو شێوەیە دوای ئەوەی دیدارێکمان سازکرد لە نێوان مەسعود و ئەفسەرەکاندا لە نەغەدە شتێکی وەك (ئەفسەرانی ئازادیخواز) دروست بوو.

دوای ئەمە ئەوە مابوو کە مەسعود بەڵێنەکەی خۆی بەجێ بێنێت، و کۆمەکی پێویستمان پێ بکات، بەڵام ئەو کۆمەکە هەر نەگەیشت.

هەندێك لە ئەفسەرەکان کەوتنە گلەیی و گازندەکردن، هەندێکیان گلەییان لە من دەکرد گوایە تەمەڵم لە بەجێهێنانی بەڵێنەکاندا (وایان دەزانی من حەماسەتی پێویستم نیە بۆ بەجێبەجێکردنی بەڵێنەکان و چەندین لێکدانەوەی تریان دەکرد.)

بێگومان منیش ئامادە نەبووم ئەم بەرپرسیارێتیە مێژوویە قورسە بخەمە سەرشانی خۆم و بە راشکاوی پێم گوتن کە ئەو کۆمەکەی بەڵێنمان پێ درابوو، لە واقیعیدا بوونی نیە. ئەگەر کەسێکیشتان دەتانەوێت بە شوێن راستییەکاندا بچن، ئەوە من کاتێکی تر لەگەڵ مەسعود رێك دەخەم، ئینجا مولازم جەمال ئەحمەد و ملازم قەرەنی دەستنیشان کران بۆ ئەوەی لەگەڵمدا بێن بۆ لای مەسعود. دیار بوو مولازم جەمال دودڵ بوو، پرسی: کاك عەبدولمسەور پێم بڵێ

چۆن لەگەڵ مەسعود قسە بکەم؟ منیش گوتم: بە راشکاوی قسەی لەگەڵ بکەو ئەگەر مشتومڕ دروست بوو لێی گەڕێ بۆ من چونکە ئەم پرسە پێویستە بەزوترین کات یەکلایی بکرێتەوە.

لەوێ رێگەم دا ملازم جەمال بە ئارەزووی خۆی قسە بکات، لە راستیدا ئەویش بە باشی کارەکەی خۆی بەجێهێنا، بەڵکو فشاری خستە سەر مەسعود بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆی بە ئاشکرا دەرببڕێت. بەڵام لەبەر هۆیەك کە نازانم چی بوو، مەسعود ئامادە نەبوو هەڵوێستی خۆی دەرببڕێت، بۆیە ملازم جەمال جارێکی تر بە مەسعودی گوت: کاك مەسعود دوێنێ پشتگیریی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشت دەکرد کەچی ئەمڕۆ ئەم هەڵوێستە چیە؟ من هیچ باوەڕێکم بە مەسەلەکە نەماوە لەبەر ئەوە دەڕۆم.

کەچی مەسعود هەر ئامادە نەبوو دیدی خۆیمان پێ بڵێت، بەڵکو مەسەلەکە فەرامۆش کرابوو بەتەواوەتی. لێرەوە ئێمەش وامان دانا کە پرسەکە کۆتایی پێ هاتوە. گرنگ ئەوە بوو من توانیم ناو و ناوبانگی خۆم پارێزگاری لێ بکەم.

دوای هەرەس لە نەغەدە لە ریزەکانی ئاوارەکاندا و لە چەندین ئەڵقەی بچوکدا مشتومڕ لەسەر رەوایەتیدان بە کۆتایی هێنان بە شۆڕش دروست بوو، زۆربەی زۆری ئاوارەکان پشتیوانییان لە کۆتاییهێنان بە شۆڕش دەکرد، بەرامبەر کەمینەیەك کە دژی کۆتاییهێنان بوو بە شۆڕش چونکە زۆرینەی خەڵك بە درێژایی چەندین ساڵ لەسەر ئەوە راهاتبوون کە پشتیوانی لە سەرکردایەتیی جوڵانەوەکە بکەن بێ ئەوەی هیچ قسەیەکیان هەبێت لەسەر بڕیارەکان، بە تایبەتی چونکە ئەو سەرکردایەتیە چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنابوو. ئەوەش متمانەیەکی کوێرانەی لای خەڵك بەرامبەر سەرکردایەتی دروست کردبوو. ئێستا لە بیرمە لای شێخ رەزا بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر هەندێك سەرنجم خستە روو دەربارەی سیاسەتی شۆڕش کەچی شێخ رەزا لە کورتی بڕییەوە گوتی: ئەوە حیکمەتی مەلا مستەفایە!

ئەم هەستە تەنیا لای بەڕێوەبەری پۆلیس نەبوو، بەڵکو لەلای زۆرینەی خەڵکەوە هەر وابوو.

له كاتى گفتوگۆمدا لەو بارەوە لەگەڵ یەكێك لە وانەی پشتیوانییان لەو بڕیارە دەكرد، وەك تەحەدا پێی گوتم: جیاوازی چیە لە نێوان ئەوەی ئێستا درێژە بە شۆڕش بدەین لەگەڵ ئەوەی دوای چەند ساڵێكی تر دەستی پێ بكەینەوە كاتێك هەلی باشترمان بۆ بڕەخسێ؟

من گوتم: پێم وانیە هەلی باشترمان بۆ بڕەخسێت بەڵكو بەپێچەوانەوە پێم وایە رەوشەكە خراپتر دەبێت، بەڵكوو من بە دووری نازانم حكومەتی بەغدا دانیشتوانە كوردەكان لە ناوچە سنوورییەكانی ئێران و توركیاو سوریا هەڵبكەنێت و لە جێی ئەوان عەرەب نیشتەجێ بكات.

بەڵام بەرامبەرەكەم بە گاڵتەوە پێی گوتم: دیسان تۆ زێدەڕۆیی دەكەیت. ئەم زانیارییە سەیرانەت لە كوێوە هێناوە؟

تێبینی ئەوەش دەكرا كە حكومەتی بەغدا هەر لە سەرەتای حەفتاكانەوە دەستی كردبوو بە بنیاتنانی قەڵای گەورەو زەبەلاح لە چەندین ناوچەی كوردستاندا بێ ئەوەی ئەم قەڵایانە هیچ سەرنجی خەڵك رابكێشن و گومانیان لا دروست بكات، بەڵام دواجار ئەو قەڵایانە بوونە زیندانی گەورە گەورە بۆ ئەو خەڵكانەی بە زۆرە ملێ لە شوێنەكانی خۆیان هەڵكەندرابوون، پێش ئەوەی فڕێ بدرێنە گۆڕە بە كۆمەڵەكانەوە وەك هەنگاوی دواتریان.

لێرەوە دەبینین ئەوەی دواجار روویدا لە دەرەوەی هەموو ئەو پێشبینیانە بوو كە ئێمە دەمان كرد، چونكە حكومەتی بەغدا شوێن پێی نازیەكانی ئەڵمانیای هەڵدەگرت بۆ قڕكردنی نەیارەكانی خۆی، بینیمان بارزانیەكانی لە كامپی قوشتەپەو كامپەكانی تر، جگە لە بەكارهێنانی چەكی كیمیایی دژ بە خەڵكی سیڤل و پەلەكردن لە پرۆسەی كۆچپێكردنی زۆرملێ و كوشتنی بە كۆمەڵ و قڕكردن.

لێرەدا كە باسی چەكی كیمیایی كرا، وا باشە ئاماژە بەوە بكەم كە ئێستا ئەوەم دەربارەی بەكارهێنانی چەكی كیمیایی دێتەوە یاد. لە راستیدا یەكەمجار كە ناوی چەكی كیمیاییم بیست لە كۆتایی شەستەكاندا بوو ساڵی ١٩٦٧ ئەو كاتە لە سەرچاوە فەرمیەكانی حكومەتەوە بیستم، لە كۆلێژی پۆلیس و دواتر

له یاسای بەغدا، ئەم بابەتە لە وانەیەکی ئێمەدا هەبوو سەبارەت بە (بەرگریی شارستانی). لەو کاتەدا مامۆستایەکی میسری وانەکەی پێ دەگوتین. ئەم وانەیە وێڕای چەند بابەتێکیتر باسی چەکی کۆکوژی تێدا بوو وەك: چەکی ئەتۆمی، بایۆلۆژی، کیمیایی و چۆنێتی پاراستنی خەڵکی سڤیل لە ئەنجامەکانی بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکانە، ئینجا باسی ئەوە دەکرا کە دەشێ ئیسرائیل لەو چەکانەی هەبێت. بۆیە هەندێك وڵاتی عەرەبی هەوڵیان دەدا ئەو چەکانە بەدەست بێنن. هەر بەرمەبنای ئەمەش سەردانێکیان پێ کردین بۆ کارگەی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی لە سەلمان پاك.

دوای ئەوەش ئاماژەیەکی تر کرا بۆ چەکی کیمیایی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە کاتی سەردانی یەکێك لە بەرپرسەکانی عیراق لەو کاتەدا (عەزیز چەلەبی) بۆ بارزان لە کۆتایی شەستەکاندا لە سەردەمی (تاهیر یەحیا) کە سەرەك وەزیران بوو، ئەو سەردانی شێخ ئەحمەد بارزانی کردو بە زمانێکی هەڕەشە ئامێز ئاماژەی بەوەدا، ئەگەر جوڵانەوەی کورد رانەوەستێت ئەوە پێدەچێت بە هۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییەوە جینۆساید روو بدات.

شێخی بارزانیش داوای لە وەرگێڕەکە کرد کە بە نوێنەری حکومەت بڵێت: (پێی بڵێ با کەمتەرخەمی نەکەن و بەزوترین کات ئەم پرسە کۆتایی پێ بێنن و دودڵ نەبن لە بەکارهێنانی ئەو چەکەدا).

لێرەدا عەبدولسەلام بارزانی کە ئەو روداوە دەگێڕێتەوە دەڵێ- لەو مانایە تێنەگەیشتم کە شێخی بارزان لە نامەکەیدا ویستی بیدا بە گوێی عەزیز چەلەبیدا، تا ئەو کاتەی عەزیز چەلەبی وەڵامیدایەوەو لە قسەکەی پێشووی پاشگەز ببۆوەو ویستی رەوشەکە ئارام بکاتەوە، ئەو گوتی: مەسەلەکە درێژەی کێشاوەو شتێك بەدەستی ئێمە نەماوە.

## سەردانی کامپی کرماشان و گەڕانەوە بێ هیچ دەستکەوتێك

ماوەیەکی زۆر بەسەر مەسەلەی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا تێپەڕیبوو و لە راستیدا من خەریك بوو بیرم دەچوەوو دەستم لێ شۆردبوو، بەلای منەوە

مەسەلەکە کۆتایی پێهاتبوو. بەڵام لە ناکاو مەسعود پەیوەندی پێوە کردم و بە دەنگێکی شەرمنانە گوتی: دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ شەڕکردن، بەڵام بڕیارمان داوە بەرپرسیارێتیەکە بە تەنیا نەخەینە سەرشانی تۆ، بەڵکو تۆ ئەندامێك دەبیت لە لیژنەیەکدا بۆ ئەو مەبەستە پێکدێت! ئێمە لەو باوەڕە داین ئەو گەشتەی بەنیاز بوویت بۆ کامپی کرماشان ئەنجامی بدەیت، ئێستا کاتی هاتوە و لەگەڵ چەند کەسێکدا گەشت دەکەیت. دیارە ئیدریس دەستی لە پێکهاتەی گروپەکەدا هەبوو، بەتایبەتی کە دوو سەرۆکی بۆ دانا بوو. کەواتە من ئێستا تەنیا ئەندامێکم و هیچی تر، هەرچەند من خۆم خاوەنی بیرۆکەکە بووم.
پێش دەستپێکردنی گەشتەکەمان بە چەند ساتێك مەسعود بردمیە کەنارەوە لە کاتێکدا ئوتومبیلەکان چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد، ئەو پشتی کردە خەڵکەکە– کە هەموو بۆ خۆ هەڵقورتاندن هاتبوون و زۆریەشیان لەوانەیە نەیانزانیبێت مەسەلەکە چیە دەستی کرد بە گیرفانیداو هەزار تومانی تازەی دەرهێناو دایمێ وگوتی: ئەم ئیشانە پارەی دەوێت ئەو پارەیە بگرە!

نازانم خەڵکەکە لە دووریی سەد مەترەوە بۆچوونیان چی بوە لە کاتێکدا ئەو بڕە پارەی پێدام، بە گوێرەی رێکەوتنی یەکەم بڕیار وابوو بە خۆم و دەیان ئەفسەر و سەدان پێشمەرگەوە بگەڕێینەوە بۆ عیراق بۆ ئەوەی حکومەتی عیراق توشی شۆك بکەین و شەڕێکی درێژخایەنی تاقەت پڕوکێن دژی حکومەتی عیراق هەڵگیرسێنین. جا ئەمە هەمووی بە هەزار تومانی ئێرانی دەکرێت!

سوپاسی خوام کرد کە ئەفسەرەکانی هاوڕێم ئەو دیمەنەیان نەبینی، چونکە ئێمە هیوامان بە بنەماڵەی مەلا مستەفا وابوو کە هاوکاریی زۆر گەورەتر لەوەمان دەکەن.

کە گەیشتینە کرماشان ئوتێلێکی باشمان گرت، من و عەلی خەلیل ژوورێکمان بەرکەوت، هەر کە دەرگاکەمان داخست عەلی خەلیل سەفتەیەك تومانی ئێرانیی دەرهێناو لەسەر جێگەکە دایناو هەمووی هەزار تومانی ئێرانی بوو. بڕی پارەکەی عەلی خەلیل نزیکەی دو ملیۆن تومان دەبوو. جا ئەگەر عەلی خەلیل

ئەو برە پارەیەی وەرگرتبێت، ئەی دەبێت عەبدولوەهاب و رەشید چەندیان وەرگرتبێت! ؟

ئەگەر شێخ سلێمان بارزانی ئەم دیمەنەی بدیبایە پێدەکەنی و دەیگوت: پێم نەگوتیت ئەوان متمانە بە تۆ ناکەن! لێرەوە دەرکەوت کە من تەنانەت ئەندامیش نەبووم لەو لیژنەیە، بەڵکو تەنیا پاشکۆیەك بووم. بە دوریشی نازانم ئەو هەموو پەکخستنەی پێشوو هەر بۆ ئەوە بووبێت کە بە تەنیا جوڵانەوەیەکی سەربەخۆ دروست نەکەم، هەرچەند من شتی وام بیر لێ نەکردبۆوە، چونکە پێشتر دەمزانی کاردانەوەی مەلا مستەفا چۆن دەبێت لەو بارەدا.

رۆژی دواتر سەردانی کامپەکەمان کرد، ئەو کامپە لە لایەن کۆمەڵێك پاسەوانی ئێرانییەوە دەسرێژی گوللەیان لێکرابوو کۆمەڵێك پێشمەرگەی تێدا کوژرا بوو هەندێکی تریش بریندار ببون، چونکە هەڵوێستی ئێران تەواو گۆڕا بوو.

لە ناو کامپەکەدا دەرکەوت ئەوانەی هاوڕێم بوون بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا من پەیوەندی بە پێشمەرگەوە نەکەم، هەرچەند هاتنمان بۆ ئەو کامپە بۆ ئەوە بوو کۆمەڵێك گەنجی بە تواناو چالاك هەڵبژێرین کە بتوانن بەرگەی سەختیەکانی شەڕی پارتیزانی بگرن بۆ ماوەیەکی درێژ. بەڵام هەرچەند دەمویست لەگەڵ یەکێکیان قسە بکەم، ئەوانی تر لە دەورم کۆ دەبوونەوەو نەیاندەهێشت قسە بکەم، لێرەدا پرسیم: ئایا ئەمانە بۆ ئەوە هاتوون کە بیرۆکەی ئەفسەرانی ئازادیخواز پیادە بکەن، یان هاتوون بۆ رێگرتن لەو کارە ؟

بۆیە هەر کە کامپەکەمان بەجێ هێشت و بەوانی ترم گوت من دەمەوێت بگەرێمەوە بۆ نەغەدە، بەو شێوەیە بە تەواوەتی دەستم لە بیرۆکەی ئەفسەرانی ئازادیخوازو هاوکاریکردن لەگەڵ بنەماڵەی مەلا مستەفا هەڵگرت. ئەوەی روویدا من بۆ مەسعودم گێڕایەوەو پێم گوت: ئەوانەی ئێوە ناردوتانن پاڵەوانی ئوتێلەکانن و نابنە پاڵەوانی سەنگەر. ئینجا پێم راگەیاند کە من بە تەواوەتی واز لەو پرسە دێنم و ئەوان ئازادن خۆیان چی دەکەن لە ئایندەدا.

# دورخستنەوەم بۆ مازندەران و پوکانەوەی پرۆژەی ئەفسەرانی ئازاد

دوای گەشتەکەمان بۆ کرماشان لە لایەن حکومەتی ئێرانیەوە فەرمانێك دەرکرا بە دورخستنەوەی ئەفسەرە کوردە عیراقییەکان لەو ناوچانەی نزیکن لە سنووری عیراقەوە، منیش یەکێك بووم لەو ئەفسەرانەی دور خرانەوە بۆ ناوچەی مازندەران. مازندەران پارێزگایەکی باکوری ئێرانە و دەکەوێتە سەر دەریای قەزوین وەك گەیلان، لەوێ لە شارۆچکەی بهشەهر نیشتەجێ کراین و لە کارگەی لۆکە و رۆنی بەهپاك دامەزرێنراین کە کارگەیەکی ناسراوی ناوچەکە بوو، پێم وایە ئەو ئیش پێدانەمان لە لایەن ساواکەوە بووە بۆ ئەوەی بە پلەی یەکەم بتوانن چاودێریمان بکەن، و دواجاریش بۆ ئەوەی باری سەرشانی حکومەتی ئێرانی سوك بکەن بەوە زۆرترین ژمارەی پەنابەران لە ناو کۆمەڵگەی ئێران بتوێننەوە.

لە راستیدا مەسعود هەوڵیدا لە نەغەدە بمهێڵێتەوە و دوور نەخرێمەوە، بەڵام خۆم داوام لێ کرد شتی وا نەکات، چونکە بە راستی پەندی باشم وەرگرتبوو لە مامەڵەکردنم لەگەڵیان لە ماوەی پێشوو.

لە راستیشدا زۆربەی ئەفسەرە کوردەکان یان گەڕابوونەوە بۆ عیراق، یان هەوڵیان دەدا لە ئێران دەربچن یان لە ناوچە دورەدەستەکانی ئێران پەرتوبڵاو کرابوون. بەڕێوەبەری کۆمپانیای (بهپاك) پیاوێکی سەودا خۆش بوو لە باری تایبەتی ئێمەش تێدەگەیشت، هەروەها کارمەند و کرێکارەکانیش هەڵوێستی جوانیان هەبوو بەرامبەرمان. لەوێ کاتی ئەوەم هەبوو هەوڵی فێربوونی زمانی فارسیی ناو بازاڕ بدەم. لەگەڵ مولازم ئەمجەد بریفکانی خانویەکمان لە بهشەهر بەکرێ گرت. ئینجا دەستم کرد بە خوێندنەوەی گۆڤار و رۆژنامە و سەیرکردنی تەلەفزیۆن و تێکەڵبوون لەگەڵ ئەوانەی بە فارسی قسەیان دەکرد. بەڵام باشترین یاریدەدەرم دو هاوڕێم بوون لە هەمان ژوری کۆمپانیاکە پێکەوە

کارمان دەکرد، هەردووکیان هەوڵیاندەدا هەڵە زمانەوانیەکانم بۆ راست بکەنەوە. بەمەش زمانی فارسیم باش بوو.

لە مازندەران هەوڵم دا پەیوەندی بە هەندێك ناسیاوی خۆمەوە بکەم بە هۆی نامەگۆڕینەوە. لەمەشدا زەرفی نامەکانی کۆمپانیام بەکار هێنا بۆ ئەوەی کاری نامەگەیاندنەکەم بۆ ئاسانتر بکات.

بێگومان ساواك هەموو ئەو نامانەی دەخوێندەوە کە بە دەستی دەگەیشت، چونکە ئەو نامانەی کە لە ئاغای سەیفیەوە بە دەستم دەگەیشت هەموویان کرابوونەوە، بۆیە هەموو جارێك بە گاڵتەوە ئاماژەم بەوە دەکرد کە نامەکانم هەڵپچڕاون. ئەویش بە زەردەخەنەیەکی فێڵاویەوە دەیگوت: ئاغای بارزانی ئێمە دەمانەوێت کارەکەت لەسەر ئاسان بکەین.

بێگومان بۆیە ویستم بگەمە مازندەران تاکوو لە تارانەوە بتوانم پەیوەندی بە باڵوێزخانەکانی وڵاتانی دیموکراسیەوە لە ئەوروپا یان لە ئەمریکا بکەم. ئەوان بایەخیان دەدا بە چارەنووسی ئەو کەسانەی لە ژێر هەڕەشەدا بوون. بەو هۆیەوە توانیم لەگەڵ زۆر باڵیوێزخانە پەیوەندی بکەم، لەوانەش باڵوێزخانەی ئەمریکا. بێگومان هەندێکیشیان بە هیچ شێوەیەك بە باسی پەنابەری و کۆچکردن رازی نەدەبوون و رێسای زۆر توندیان لەو بارەوە هەبوو.

پێدەچێت ئەم هاتوچۆیەی من لە لایەن دەزگای ساواکەوە زانرا بێت. هەرچەند من هەوڵم دەدا بیشارمەوە، بەڵام ئەوانیش درەنگ بە کارەکەی منیان زانیبوو، چونکە توانیبووم سەردانی زۆر باڵوێزخانە بکەم.

رۆژێك داوام لێ کرا سەردانی دەزگای ساواك بکەم، لەوێ ئاغای سەیفی پێی گوتم، کە ئەوان ئاگایان لە گەشتەکانی من هەیە بۆ تاران و ئەم کارەش قەدەغەیە.

لە پێشدا هەوڵمدا نکوڵی بکەم، بەڵام ئاغای سەیفی بە پێکەنینەوە پێی گوتم: هەندێ وێنەمان لایە قسەکانمان دەسەلمێنن هەر بە راستیش هەندێك وێنەی دەرهێنا، بەڵام ویستم پاساو بۆ گەشتەکانم بێنمەوە بەوەی کە بهشەهر شارێکی بچوکە شوێنی رابواردنی باشی لێ نیە. بەڵام دیسان پێکەنی و گوتی:

ئێمە دەزانین تۆ لەو کەسانە نیت کە سەردانی شوێنەکانی رابواردن دەکەن، ئینجا گوتی: گرنگ ئەوەیە لێرە بەدواوە ئەم هاتوچۆیە نەمێنێت. لە راستیشدا من هێندە بالۆێزخانەم کرد بوو کە چیتر پێویستم بە سەردانی بالۆێزخانەی تر نەبێت، ئەوە مابوو چاوەڕوانی ئەنجامەکان بکەم، بۆیە هەستم کرد داواکەی ئاغای سەیفی بۆ من لەبارە، بۆیە رەزامەندیم دەربڕی. بەلام بەو مەرجەی مۆڵەتمان بدات سەردانی مەشهەد بکەین. ئاغای سەیفی سەبارەت بەم داوایە گوتی: تۆ شیعە نییت بۆچی مەشهەد؟ من گوتم: موسلمانان هەموویان رێز لە ئالو بەیت دەگرن. ئەویش رازامەندی دەربڕی، بەلام دوای ئەوە بەردەوام بە حاجی بارزانی بانگی دەکردم.

یەکێك لەو سەردانانەی ئەنجاممانداا ئەوە بوو چووین بۆ گوندی گورگان چونکە هەوالمان پێگەیشتبوو کە هەندێك لەو بارزانییانەی لە فەرمانگەی کشتوکالی هەولێر کارمەند بوون، ئێستا دور خراونەتەوە بۆ ئەو گوندە. لەوێندەر حاجی عەبدولڕەحمان و خێزانەکەیم بینیەوە، بەلام هەر پێش ئەوەی دابنیشین یەکێکیان گوتی: باری ژیانمان لێرە زۆر خراپە و تۆش هۆکاری ئەم بارە بوویت، چونکە داوات لێ کردین پال بدەین بە شۆڕشەکەوە.

بەلام لە خۆشبەختیی من ئەوە بوو حاجی عەبدولڕەحمان نەیهێشت وەلام بدەمەوە بەلکوو خۆی وەلامی دایەوە گوتی: بە شێوەیەکی واقیعیانە قسە بکەن و راستی بلێن عەبدولمسەور سەرپشکی کردین لە نێوان مانەوە لە هەولێر و چوونە ناو ریزەکانی شۆڕش. ئێمە بە تەواوی ئارەزووی خۆمان هاتنە ناو شۆڕشمان هەلبژارد. بێگومان خۆشحال بووم کە یەکێك لەوان خۆی راستییەکە بلێ. حاجی عەبدولڕەحمانیش ئەوەی کرد کە من پێم خۆش بوو.

لە کاتێکدا من چاوەڕوانی ئەنجامی هەولەکانم بووم بۆ دەرەوەی ولات، هەندێك لە خاوەن بڕوانامەکان داوایان لێ کردم کە سەردانی مەلبەندی کاروباری پەنابەران بکەم بۆ باشترکردنی باری بژێویان لە رێگەی دۆزینەوەی کارێکی وەها کە لەگەل بڕوانامەکانیاندا بگونجێت، وەك دەرچوانی بەشەکانی فیزیك و کیمیا. منیش سەردانی مەلبەندەکەم کرد، بەلکو چارەسەرێکی وا بدۆزینەوە کە

هەردوولا پێی رازی بن. لەگەڵ بەرپرسی یەکەمیان کۆ بومەوە، ئەویش دەرچووی نەمسا بوو و لەوە پێش دەمناسی. بەرێکەوت موحسین دزەییشم لەوێندەر بینی. لەوێ کێشەی ئەوانی ترم باسکرد و ئاماژەم بەوەدا کە هەموان سودمەند دەبن ئەگەر خاوەن بڕوانامەکان لە شوێنێکی باش دابمەزرێن. ئێران سودمەند دەبێت لە پسپۆرییەکانی ئەوان چونکە چەند پسپۆرێکی دەست دەکەوێت لەو بوارانەدا، ئەوانیش سودمەند دەبن چونکە بڕوانامەکانیان بە هەند وەردەگیرێن و لە لایەکی تریشەوە موچەکانیان زیاد دەکات.

بەلام بەرێوەبەر بە رویەکی گاڵتە ئامێزەوە پێی گوتم: بەرێز بارزانی دەترسم بڕوانامەکانی ئەوانیش وەك ئەوانەی بەرێز دزەیی ساختە بن، تەنانەت هەندێکیان بڕوانامەکانیان هێند بەرزە شایستەی ئەوەن بکرێن بە وەزیر.

بێگومان منیش هەندێك بە تورەیی وەلامم دایەوە، چونکە بەم قسەیە ئەو دەیویست بە درۆزن تاوانبارم بکات بەڵکو بە ساختەکاریش تاوانبارم بکات. بۆیە تێم گەیاند ئەگەر ئەو بۆچوونی وەهایە بەرامبەری، کەواتە پێویست بە قسەکردن ناکات. بۆیە رومکردە دەرگاو ویستم دەربچم، گوتم من ئامادە نیم ئەم جۆرە مامەڵەیە قبوڵ بکەم. بەلام بەرێوەبەر و کاك موحسینیش بە پەلە رایانگرتم لای دەرگاکەوە، کاك موحسین بە کوردی گوتی: تکا دەکەم هەندێك ئارام بە. هەروەها بەرێوەبەرەکەش داوای لێبوردنی کرد، هەوڵیدا باسی ئەوە بکات کە چۆن رۆژانە بڕوانامەی ساختەی بۆ دێنن، و ئەویش بۆیە ئەو کاردانەوەیەی هەبووە. لە راستیدا منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ئەوە راست بێت کەواتە چۆن بتوانین گلەیی لە بەرێوەبەر بکەین، کە دنیایەك بڕوانامەی ساختەی لایە؟

دواجار بەڵێنی دا خۆی بە دواداچوون بۆ ئەو پرسە بکات و پێی وابوو مسەلەکە بۆ هەردولا سودبەخش دەبێت. ئەگەر دەرکەوت کە بڕوانامەکان ساختە نین.

سەبارەت بە کاك موحسین منیش گلەیی لێ ناکەم. بە دوریشی نازانم ئەو بڕوانامانەی بە دڵپاکی وەرگرتبێت لەو خەڵکانەو هێنابێتی بۆ بەرێوەبەر، بێ

ئەوەی بە خەیاڵیدا هاتبێت کە ئەو بڕوانامانە ساختەن و لە ئەنجامیشدا توشی شەرمەزاری بووە.

من لەو باوەڕەدام مرۆڤ دەبێت لە هەموو هەلومەرجێکدا کەرامەت و کەسێتیی خۆی بپارێزێت، بە جۆرێك نەهێڵێت ئەوانی تر سوکایەتی پێ بکەن. بەو شێوەیە پەیوەندیی باشتر دروست دەبێت. پێشم وایە ئەو هەڵوێستەم پەیوەندیەکی باشتری لە نێوان من و بەڕێوەبەردا دروست کرد. دواتر کاتێك پێم ڕاگەیاند دەمەوێت بچمە دەرەوەی ئێران وەك پەنابەر، هەوڵیدا پاشگەز ببمەوە لەو بڕیارە و ئەوەی خستە بەردەمم کە لە ئێران ئاسانکاریی زیاترم بۆ بکات، وەك ئەوەی بمگوێزێتەوە بۆ تاران، یان شوقەیەکم بداتێ، دەرفەتی خوێندنم بۆ بڕەخسێنێت لە زانکۆی تاران، موچەی باشم هەبێت. بەڵام من پێم ڕاگەیاند کە بڕیارەکەم کۆتاییەوە لێی پاشگەز نابمەوە. دوایی گوتی: بەلایەنی کەمەوە هیوادارم وەك دوو هاوڕێ جیا بینەوە. منیش وەڵامم دایەوە: دڵنیا بە کاتێك دەچمە دەرەوە تەنیا یادەوەریی جوانی خۆشی ئێران لەگەڵ خۆم هەڵدەگرم. بێگومان قسەکەم هەندێك زێدەڕۆیی تێدا بوو، بەڵام بەهەر حاڵ ئەو بەم قسەیەم دڵخۆش بوو. دەشزانم ئەو بەڕێوەبەرە کە پیاوێکی سڤیل بوو ئاگاداری ئەو گێچەڵانە نەبوو کە لە لایەن ساواکەوە لە مازندەران توشمان دەبوو.

کاتێك هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە هەندێك خێزان گەیشتونەتە کەرەج بڕیارمدا سەردانێکیان بکەم. لە ناو ئەوانەدا خێزانی شێخ محەمەد خالید بارزانیش هەبوو. ئەندامانی خێزانەکەی خۆشم هاتبوون. کاتێك سەردانی ماڵی شێخ محەمەد خالیدم کرد بینیم لە ژوری میوان دانیشتوەو و هەواڵی ئاوارەکانی دەپرسی. منیش پێم ڕاگەیاند "زۆربەیان دەیانەوێت لەبەر نەداری و نەبوونی بژێوی باش بگەڕێنەوە بۆ عیراق، یەکێکیش لەوانە ئەحمەد گەنجی بوو کە هاوڕێیەکی زۆر نزیکمە و لە مازندەرانە، من زۆر خەمبارم کە ناتوانم کۆمەکی بکەم".

لێرەدا ئیدریس کتوپڕ هەڵی دایە و گوتی: بێگومان ڕەوشی ئاوارەکان خراپە چونکە تۆ گوێیان پێنادەیت.

سەیرە، ئەو ئیدریسەی خۆی لە سەرۆکایەتی لیژنەی ئاوارەکان هەڵی تەکاندم چەندین تۆمەتی هەڵبەستراوی خستە پاڵم، ئێستا ئەو بەرپرسیارێتی باری خراپی ئاوارەکان دەخاتە ئەستۆی من.

لە راستیدا بە زۆر خۆم گرت و تورەیی خۆم خواردەوە بۆ ئەوەی وەڵامی نەدەمەوە. دوای ئەوە هەڵێکم قۆستەوە و روخسەتم لە شێخ خالید وەرگرت بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ مازندەران.

## مەسەلەی ئەفسەرانی ئازاد

من گومانم لەوەدا نیە کە بڕیاری دورخستنەوەی ئەفسەرانی کورد لە ناوچە سنوورییەکان پەیوەندیی راستەوخۆی بە پرسی ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە هەیە.

لە مازندەران چەند جارێك بانگهێشت کرام بۆ دەزگای ساواك لە شاری ساری، مەڵبەندی پارێزگای مازندەران، بۆ لێکۆڵینەوە. بەڵام من بە هەموو شێوەیەك نکوڵیم لێ کرد. کاتێك باسی ئەفسەرانی ئازادیخوازیان لێ پرسیم، دەستبەجێ وەڵامم دانەوە: بەڵێ ئەوە ئەو رێکخراوە بوو کە سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسر دایمەزراند و سەرکرایەتیی کودەتاکەی کرد دژی رژێمی پاشایەتی لە میسر. بەڵام ئەوان وەڵامیان دامەوە: مەبەستمان ئەوە نیە. کاتێك هەمان پرسیاریان لێ کردمەوە گوتم: دەشێت ئێوە مەبەستمان ئەو رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازە کە عەبدولکەریم قاسم دایمەزراند بوو لە عێراق. بەڵام دیسان گوتیان مەبەستمان ئەوە نیە، بەڵکوو مەبەستمان رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازی کوردە. من سەرسوڕمانی خۆم دەربڕی سەبارەت بە قسەیەکی لەو شێوەیە، گوتم: هیچ ئاگاداری شتێکی وەها نیم، باوەڕیش ناکەم شتێکی وا هەبێت.

لە راستیدا لەو باوەڕەدام کە بەخت یاوەرم بوو پەنایان نەبرد بۆ شێوازی تر بۆ ئەوەی قسەم لێ دەربێنن، وەك ئەوەی لە رەزایە بینیم کە شێوازێکی شارستانی نەبوو لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکدا.

لێرەدا کە باسی مازندەران دەکەین، دەبێت باسی ئەوەش بکەین کە لە ماوەی چاوەڕوانیمدا بۆ ئەوەی مافی پەنابەریی سیاسیم بۆ دەربچێت لە دەرەوە، لەگەڵ هەندێك ئاوەرەی تر سەردانی شاری گورگانی نزیك بهشەهرمان کرد، چونکە ئەو شارە شارێکی گەشتیاری بوو. لەوێ هۆتێل و ریستۆرانتێکی گەشتیاری هەبوو و هۆڵێکی گەورەشمان هەبوو. وەك باسیان کرد ئەو شوێنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە سوپای روس لەوێ بوو. لەکاتی نێوەڕۆدا چووین بۆ ریستۆرانتەکە. لە راستیدا خواردنەکانیان پاك و باش بوو.

یەکێکمان پێشنیاری کرد هەندێك پیاسە بکەین بە ناو شەقامەکاندا بۆ ئەوەی هەندێك شوێنەوار ببینین، هەر کە دەستمان کرد بە گەڕان، دەنگی تەقە و دەستڕێژی گوللە بەرگوێمان کەوت لە ناوەڕاستی شارەکەدا. دوو برامان لەگەڵ بوون (سیداد و ویداد) کە خەڵکی کەرکوك بوون، یەکێکیان گوتی: بە خوا لەگەڵ خۆماندا ئاژاوەمان بۆ ئەو خەڵکە هەژارەش هێنا!

من گوتم: کاکە پەلە مەکە با بپرسین بزانین چیە، لەوانەیە ئەم شتانە لەم شارەدا زۆر روو بدات، بەڵام زۆربەی خەڵکی شار لە هەموو تەمەنەکان جەختیان لەوە دەکردەوە کە بە درێژایی تەمەنیان شتی وایان نەدیوە! هەر قسەکانمان تەواو بوو دو براکە دایانە قاقای پێکەنین و دەیانگوت: ئەی راستمان نەگوت: ئێمە نەگبەتی دێنین؟!

کاتێك ئێمە لە مازندەران بووین هەواڵمان پێگەیشت کە جەلال تاڵەبانی لە سوریا هەوڵ دەدات رێکخراوێکی سیاسی پێك بێنێت بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ کوردستانی عیراق و درێژەدان بە شۆڕش.

هەندێك ئەفسەریش خۆیان گەیاندبوە سوریا لەوانەش مولازم جەمال. باڵوێزخانەی سوریا یەکێك بوو لەو باڵوێزخانانەی کە منیش ویستم لە رێگاکەیەوە دەرباز بم، بەڵام نەمتوانی.

# پەنا بردن بۆ نەمسا

لە کاتێکدا من چاوەڕوان بووم بە پلەی یەکەم لە باڵوێزخانەی ئەمریکاوە وەڵامم بۆ بێتەوە، فشارەکانی ساواك بۆ سەرم زیاتر دەبوون. هەر لەو ماوەیەشدا دەستگیر کردنی ئەفسەرێکمان لە تاران ببوە هۆی نیگەرانیمان. لەو کاتەدا عەبدولسەلامی برام پێی گوتم ئەگەری داواکردنی پەنابەرێتی لە نەمسا هەیە و منیش رەزامەندیم دەربڕی کە بمخاتە ناو ئەو لیستەوە.

لە راستیدا نەمسا لە هەموو ولاتانی تر زوتر وەڵامی داینەوە، جا بۆ ئەوەی لەوە زیاتر لە لایەن ساواکەوە توشی ناڕەحەتی و لێپێچینەوە نەبم، بێ دودڵی پەنابەرێتیم لە نەمسا پەسند کرد، بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی ئەمریکیەکان بکەم، هەرچەند من ئامانجی یەکەمم ئەوە بوو بچم بۆ ئەمریکا.

کاتێك وادەی رۆیشتن بۆ نەمسا نزیك بۆوە بانگهێشت کراین بۆ تاران بۆ ئەوەی هەندێك پشکنینی پزیشکیمان بۆ بکرێت. ئەویش بێگومان هەندێك کاتی دەویست، بۆیە بڕیارم دا ماوەی چاوەڕوانی لە کەرەج بەسەر بەرم و سەردانی خزم و کەسەکانم لەوێ بکەم.

دیسان لەوێ دیدارێکی بێ پێشوەختەم لەگەڵ ئیدریس بارزانی بۆ دروست بوو. لە نزیك ماڵی شێخ محەمەد خالید بارزانی. ئەو دەستی کرد بە قسەو گوتی: دەمانەوێت جارێکی تر هاوکاریی یەکتر بکەین!

ئەم دەستپێشخەریەم بەلاوە سەیر بوو پاش ئەو هەموو گرفت و ناڕەحەتییەی بێ هیچ پاساوێك بۆیان خولقاندم. بە راستی تەنیا بە بیرکردنەوە لەوەی جارێکی تر کاریان لەگەڵ بکەم، توشی قێزهاتنەوە دەبووم، بێجگە لەوەی هیچ متمانەیەکمان لە نێواندا نەبوو، بۆیە بە توندی هەر هاوکارییەکم لە گەڵیان رەتکردەوە.

هەروەك چۆن هەموو ئەو رەفتارە منداڵانەیەم وەبیر هێنایەوە کە زۆر جار لەگەڵیان ئەنجامم داون و هەموو جارێکیش ئیدریس سوێندی بە خوداو پیرۆزییەکانی بارزانی دەخوارد کە جارێکی تر شتی وا رو ناداتەوە.

دواجار گوتی: بەهەرحاڵ هیوادارم لەگەڵ مەسعود قسە بکەین چونکە ئەو لەبری باوکمان و لەبری منیش سەردانت دەکات. پێکەوە قسە بکەن و دوای ئەوە بڕیار بدە. من گوتم بە هەر حاڵ ئەمە بێ مەرج نابێت چونکە من هیچ باوەڕێکم پێتان نەماوە.

ئەوەی سەیر بوو عەبدولسەلامی برایشم زۆری لێ دەکردم تا جارێکی تر کاریان لەگەڵدا بکەم، لەمەشدا عیزەت سلێمان بەگی درگەڵەیی پشتیوانیی براکەمی دەکرد و دەیگوت عەبدولمسەوور واز لە مەسەلەکە مەهێنە.

مەسعود لە ماڵی خۆم سەردانی کرد و دیدارێکی دوورو درێژمان ئەنجامدا و داوای کرد جارێکی تر هاوکارییەکەمان نوێ بکەینەوە. منیش ئەوەم بۆ روونکردەوە کە چەند مەرجێکی بابەتیم هەیە کە ناشێت جارێکی تر فەرامۆش بکرێت و رەفتارەکانی پێشویانم وەبیر هێنایەوە، مەرجەکانیش بە کورتی ئەمانەی خوارەوە بوون:

١–نابێت بوار بدرێت بە کەسانی ناوزڕاوو دزو سیخوڕ و لێنەهاتو بۆ کارکردن هەروەها گوتم: مەسعود، هیچ رەوا نیە دزێك دەگیرێت کەچی ئێوە لەبری ئەوەی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن ئازادی دەکەن، یان سیخوڕێك دەستگیر دەکرێت کەچی ئێوە ئازادی دەکەن، چونکە کەسێك بە جوانی سەروکاری ئیشێك بکات ناتوانێت شتی وا پەسەند بکات.

٢–مەسعود ئەگەر رەفتاری هەڵەی ئێوە نەبوایە و پشت گوێ نەخستنی پرۆژەی ئەفسەرانی ئازاد نەبوایە، ئێمە ئێستا لە کوردستان دەبووین و هەر دوای کۆتایی هاتنی بزوتنەوەی کورد ئێمە درێژەمان بە شۆڕش دەدا، خۆ ئەگەر ئێوەش ئامادە نەبن بۆ درێژەدان بە خەبات ئەوە کێشەی کورد بەهۆی ئەوەی کێشەیەکی رەوایە کەسانێکی تر پەیدا دەبن کە بەرگریی لێ بکەن. هەر بەم بۆنەیەوە من لە مازندەران بووم هەواڵم پێگەیشت کە جەلال تاڵەبانی لە

سوریایه و هەوڵ دەدات بگەڕێتەوە بۆ عیراق بۆ درێژەدان بە شۆڕش. بە دوری نازانم ئەو هەواڵە بە ئێوەش گەیشتبێت، جەلال تاڵەبانی لە سوریا خەریکی جوڵانەوەیەکە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە. بەڵام مەسعود بێدەنگ مایەوەو هیچ کۆمێنتێکی لەسەر قسەکانم نەدا، ئەوەش مانای وابوو کە هەواڵەکە راستە.

من درێژەم بە قسەکانم دا: مەسعود لە رابوردودا زۆر ناکۆکیی خوێناوی لە نێوان ئێوە و ئەواندا هەبوو، چەند کەس لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیانەدا کوژراون؟

مەسعود دیسان بێدەنگ بوو چونکە نەیدەتوانی ژمارەی دروستی قوربانییەکان بڵێت. وتم لەبەر ئەوە و بۆ ئەوەی جارێکی تر خوێن نەرژێت و هەڵەکانی رابوردو دوبارە نەکرێتەوە، دەبێت جۆرێك لێك تێگەیشتن لە نێوان هەردو لایەندا دروست بێت، تا بە لایەنی کەمەوە رێگە بگرن لە کوشتاری نوێ.

مەسعود، لەبەر ئەوەی ئێمە دوژمنمان زۆرە بۆیە لەو باوەڕەدا نیم تاکە حزبێك بتوانێت بە تەنیا ئەم ململانێ سەختە بە تەنیا بەڕێوە بەرێت و سەرکەوتوش بێت، بەڵکوو من گومان دەکەم لەوەی ئەو سەرکەوتنە ئاسان بێت، تەنانەت ئەگەر هەموو هێزەکانیش کۆ ببنەوە و هاوکاریی یەکتر بکەن، بەڵام ئەوەی بێگومانم لێی ئەوەیە ئەگەر ئەو هێزانە خەریکی ململانێ بن لەگەڵ یەکتر، ئەوا بەدڵنیاییەوە شکست دێنن.

بێتاقەتی و ناڕەحەتی لەسەر رووی مەسعود دیار بوو، ئاشکرا بوو کە لێك تێگەیشتن لەگەڵ باڵی تاڵەبانی شتێکە بە ئەقڵی مەسعودا ناچێت و ناتوانێت بە ئاسانی پەسەندی بکات. بەڵام من زۆر بە راشکاوی ئەوەم بۆ دوپاتکردەوە کە بێ ئەو لێك تێگەیشتنە من بە هیچ شێوەیەك ناتوانم هاوکارییان بکەم، چونکە بەراستی لە رابوردودا من لایەنێك نەبووم لەم ململانێیە و ناشمەوێت لە ئایندەدا لایەنێك بم تیایدا، لەبەر ئەوە دەبێت لەم ساتەدا لەبری باوك و براکەشی بڕیار لەسەر ئەم خاڵە بدات.

لە کۆتاییدا مەسعود بەڵێنی دا پابەند بێت بەو خاڵەوە، بەڵام بە ناچاری بەڵێنیدا!

لێرەدا دەبێت ئاماژە بە رووداوێك بكەم كە لە شەستەكاندا روویداوەو منیش لایەنێكی ناراستەوخۆ بووم تیایدا و پەیوەست بوو بەشەڕی ناوخۆوە. كاتێك ئەفسەری پۆلیس بووم لە سەرەتای حەفتاكاندا، كەسێك كە لە شەستەكاندا خزمەتگوزار بوو لەو بەشە ناوخۆییەی من لێی دەخەوتم لە هەولێر كاتێك خوێندكاری ناوەندی و ئامادەیی بووم، وا بزانم ناوی مام عومەر بوو، گوتم چیت دەوێ بۆت بكەم؟

مام عومەر باسی بەسەرهاتی قوربانیەكی شەڕی ناوخۆی كرد، كە كوژراوە و كەس و كارەكەشی هۆی كوژرانەكەی نازانن و داوای لێ كردم هۆی كوشتنەكەی بدۆزمەوە، ناوی قوربانیەكەشی دامێ، منیش بەڵێنم پێدا هەر كاتێك ئیدریس یان مەسعودم بینی باسی بابەتەكەیان لا بكەم. پاش ماوەیەك بە مەسعود گەیشتم و بابەتەكەم بۆ باس كردو تكام لێ كرد بە راستی بابەتەكەم بۆ باس بكات، ئەویش بەو شێوەیە بۆی باسكردم:

ململانێیەك لە نێوان ئێمە و تاقمی تاڵەبانیدا سەری هەڵدا و ئەوان كەمینیان بۆ هەوادارەكانی ئێمە دادەنا و دەیانكوشتن، ئێمەش بە هەمان شێوە وەڵاممان دانەوە و كەمینمان دانا بۆ ئەندامەكانی ئەوان بەتایبەتی ئەوانەی هەوادارەكانی ئێمەیان تیرۆر دەكرد. هەواڵمان پێگەیشت كە یەكێك لەوانە لە كات و شوێنێكی دیاریكراودا ئامادە دەبێت و منیش فەرمانم دەركرد كە بیكوژن. بەڵام ئەوەی رویدا ئەوە بوو ئەو كەسە نەهاتە ئەو شوێنە، بەڵكوو كەسێكی تر لەو شوێنە بوو –ئەو كەسەی ئێستا ناوت برد– ئەو لە شوێنێكی نەگونجاودا بوو لە كاتی نەگونجاودا. ئیدی بەو شێوەیە بە هەڵە ئەو كەسە كوژرا هیچ نیازێكی كوشتنیمان نەبوو. ئەوە راستیەكەیە. دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ هەولێر ناردم بە شوێن مام عومەردا بەسەرهاتەكەم بۆ گێڕایەوە. بەهۆی ئەوەی نەیانتوانیوە ناسنامەی كەسەكە دیاری بكەن بێتاوان ئەو كەسەیان كوشتوە.

مام عومەر بێدەنگ بەرامبەرم دانیشت و بە واقوڕماوی سەیری دەكردم بێ ئەوەی یەك وشە بڵێت، دەشتێت لەبەر ئەوە بوبێت توشی شۆك بو بێت، ئێستاش زۆر جار كە باسی شەڕی ناوخۆ و مەینەتییەكانی دەكرێت، وێنەی مام

عومەر دێتەوە بیرم، کە چەند بە دەسەوسانی و واقوڕماوی، بێ ئەوەی بتوانێت هیچ شتێك بکا لە هەمبەر چارەنوسێك کە ناتوانێت بیگۆڕێت.

٣-لەبەر ئەوەی ئێمە دەچووین بۆ وڵاتێکی دیموکراتی لەو وڵاتە خەڵك بە ئارەزومەندانە نوێنەرەکانی خۆیان هەڵدەبژێرن، ئەوە تێگەیشتن و پشتیوانیی وڵاتانی ئەوروپا زیاتر دەکات بۆ کێشەکەمان، واتە نابێت لەوێندەر کەس بە زۆر بسەپێنرێت، چونکە باشترین رێگا هەڵبژاردنە.

من نکوڵی لەوە ناکەم کە ئەم پێشنیارە تەنیا بۆ ئەوە بوو وردە بنەماکانی دیموکراسی لە ئایندەدا بەگشتی پراکتیزە بکەین. با لەسەرەتادا لە دەرەوە دەست پێ بکەین.

بەڵام دیسان لێرەدا وەك مەرجی دووەم مەسعود بە ئاسانی بیرۆکەکەی پێ قەبوڵ نەکرا و دەیگوت: جا کێ ئەو کەسە مسۆگەر دەکات کە تۆ هەڵیدەبژێریت؟!

من گوتم گرنگ ئەوەیە ئازادیی هەڵبژاردن بدەین بە خەڵك. سەبارەت بە خۆم شتی زۆر هەیە ئەنجامی بدەم، ئەو کاتە ئەگەر هەڵنەبژێردرام بەرپرسیارێتیم لەسەر شان نابێت، بەڵکوو دەکەوێتە ئەستۆی کەسی هەڵبژێردراو منیش ئازاد دەبم.

لە راستیدا نازانم دانیشتنەکەمان چەندی خایاند، چونکە زۆر شتمان باسکرد. هەندێك لەو شتانە لاوەکی بوون، وەك ئەوەی مەسعود داوای لێ کردم پەیوەندییەکانم لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان بپچڕێنم، ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە کوڕانی مەلا مستەفا کاتێك ناکۆکییان لەگەڵ کەسێکدا بێت، بایکۆتی دەکەن و داوا لە خەڵك دەکەن ئەوانیش بایکۆتی بکەن.بەڵام من لە هۆی ئەو داوایەم پرسی، ئەگەر کابرا ماڵی شۆڕشی خواردبێت یان تاوانبار بێت بە سیخوڕیکردن؟

بەڵام مەسعود ئەو تۆمەتانەی رەتکردەوە و دڵنیای کردمەوە کە مەسەلەکە شتی شەخسییە. بەلای منەوە ئەو پاساوە بەس نیە، هەرچەند پەیوەندیم بە دکتۆر مەحمود عوسمانەوە تەنیا شتێکی روکەش بوو. هۆی ئەم هەڵوێستەی

منیش ئەو ئەزموونانە بوون کە لە رابوردودا هەمبوە لەگەڵیان، لە لایەکی ترەوە من بەوە رازی نەدەبووم ببمە داردەستی ئەوان و بە ئارەزوی خۆیان دژ بەم و بەو بەکارم بێنن هەر کاتێك ویستیان، بەتایبەتی کە هیچ پاساوێك نەبێت بۆ ئەو دژایەتییە.

دوای قسەکانمان مەسعود گوتی: ئەمەش راسپاردەیەکە لە مەلا مستەفاوە بۆ تۆ کە داوای کردوە پێتی بدەم. راسپاردەکە بریتی بوو لە نامەیەکی قاوەیی بچوك و داخراو. منیش راسپاردەکەم وەرگرت بێ ئەوە بزانم چی تێدایە، هەرچەند وام گومان دەکرد نامەی مالآوایی بێت یان شتێکی لەو شێوەیە.

وەك نەریتی کۆمەڵایەتی خۆمان، تا دەرگای دەرەوە مەسعودم بەڕێ کرد، لە بەر دەرگا پێی گوتم عەبدولمسەوور تۆ هەمیشە را و بۆچوونی باشت هەیە، بەڵام وا باشترە بەئاشکرا نەیانڵێیت، بەڵکو بە منی بڵێیت و منیش بە خەڵکی رادەگەیەنم؟! من ئەو قسەیەی دواییم فەرامۆش کرد، بەڵام لە خۆم پرسی: ئەگەر لەسەر ئەو قسەیەی مەسعود رازی بم کەواتە دواجار من چیم؟

پاش ئەوەی مەسعود رۆیشت زەرفەکەم کردەوە کە راسپاردەکەی مەلا مستەفای تێدا بوو بەقسەی مەسعود، بینیم سەد دۆلاری ئەمریکی تێدایە.

ئەم رووداوە رووداوەکەی کرماشانی وەبیر هێنامەوە، بەڵام من کە لە بهشەهر کارم دەکرد هێندەم پارە کۆکردبۆوە کە پێویستیم بەو برە پارەیە نەبێت. ئەوەی سەیر بوو ئەگەر شتەکان وا رۆیشتبان وەك لە دیدارەکەدا لەسەری رێککەوتین، ئەوا دەبوو کاروبارەکانی خۆم لە نەمسا رێك بخەمەوە و دوای ئەوە بچمە سوریا و لەوێوە بۆ کوردستانی عیراق بۆ درێژەدان بە شۆڕش.

ساڵی ۲۰۰٦ واتە دوای سی ساڵ لە هەولێر، سەعدی پیرەم بینی ئەو یەکێك بوو لە کادرە پێشکەوتوەکانی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و لە مازندەران یەکترمان ناسیبوو. هەر لەوێ دەمزانی ئەو بە ئاشکرا مەیلی بەلای باڵی جەلال تاڵەبانیدا هەبوو. ئەو سوێندی دام کە پێی بڵێم ئەو زەرفەی لە مەلا مستەفاوە پێم گەیشت چەندی تێدا بوو. منیش لەبەر سوێندەکە برە پارەکەم پێ گوت. ئەو بەلایەوە سەیر بوو و پێی گوتم ئەو خۆی –سەعدی– بڕی چوار هەزار

دۆلاری لەو زەرفە وەرگرتوە، چونکە هەندێك کەس لای مەلا مستەفا نێوەندگیرییان بۆ کردبوو. پرسی: بۆچی وا بوە؟ منیش گوتم: دەبێت پرسیارەکە بە شێوەیەکی تر بکرێت. تۆ ئاراستەی سیاسیت زانراوە، چۆن ئەو برە پارەیەت پێ دراوە لە کاتێکدا کەسێکی لێ بێبەش دەکرێت کە لە سەر بنەماڵەی مەلا مستەفا و کوڕەکانی هەژمار دەکرێت!؟

لێرەدا سەعدی دای لە قاقای پێکەنین، چونکە سەعدی زۆربەی کات قسەی خۆش دەکات، گوتی: تا ئێستاش دنیا وەك خۆیەتی سەبارەت بە تۆ. کاك مەسعود وەك ناسراوە، خودا شاهیدە، بە هەمو شێوەیەك هاوکاریی بنەماڵەی شێخ سلێمان بارزانی دەکات، لەکاتێکدا ئەوانە لە هیچیان کەم نیە و خۆش دەژین، بەڵام بەشێکی تر هیچی نادرێتێ، بەڵکوو هەمیشە توشی ناڕەحەتی و تەنگ پێهەڵچنین دەبنەوە!

هەرچەندە قسەکانی سەعدی ئازار بەخش بوون، بەڵام راستییەکەی گوت، منیش ناچار بووم دان بە دروستیی قسەکانیدا بنێم.

مەسعود ماڵەکەی بەجێ هێشت و دوای ئەوە نەمبینیەوە، تا ئەو شەوەی لە ڤیەننا کەمینێکیان بۆ دانابوو بۆ ئەوەی بیکوژن. هەرچەند ئەو هەندێك ناوی بۆ باس کردم گوتی دەتوانن هاوکاریت بکەن لە هەموو بارێکدا، بەڵام لە راستیدا ئەو هەڵە بوو لە هەڵسەنگاندنیدا وەك دوایی دەرکەوت، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوە مەسەلەیەکە رای جیاواز هەڵدەگرێت، وەك دوایی دەیبینین.

لێرەدا دیسان پرسیارێك خۆی قوت دەکاتەوە: ئەگەر بە جدی و بە شێوەیەکی دروست بۆچوونەکانی من کاریان پێ بکرایا، ئایا دەشیا شەڕی ناوخۆ هەڵبگیرسایە. ئەو شەڕەی کە پاڵنەرەکەی دەستگرتن بووە بەسەر پارەو دەسەڵاتدا و تۆڵە سەندنەوە لە نەیارە سیاسیەکان بەهەر نرخێك بێت. ئەو شەڕەی کە زیاتر لە دە هەزار لاوی کوردستانی بە کوشتدا، ئەمە بێجگە لە بریندار و ئاوارە و زیانی ماددی و ناشیرین کردنی ناوبانگی کورد. من پێم وایە دەکرا شەڕی ناوخۆ رو نەدا، ئەگەر کەسانێکی بێلایەن ئەو ئەرکەیان بگرتبایەتە ئەستۆ لەوانەی کە لە شەڕی ناوخۆی پێشوو بەشداریان نەکردبوو.

لەو چەند رۆژەدا کە لە کەرەج مامەوە سالّح مەحمودیش سەردانی کردم، شتی وا هەرگیز رووی نەدابوو لەوەپێش. بە دوریشی نازانم ئەو سەردانە دوای سەردانەکەی مەسعود هاتبێت. خۆم ئەو رەفتارەی سالّحم بەلاوە سەیر بوو بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەر وەك میوانێکی ئاسایی پێشوازیم لێکرد و لەو باوەڕەدا بووم کە سەردانەکەی پەیوەندیی بە مالاّواییکردنەوە هەیە.

بەلاّم هەر کە دانیشت هەولّیدا قسەی ناشیرین بە شێخ عەبدولڕەحمان بلّێت و وەك دوژمنی بارزان و بنەمالّە باسی کرد.

بێگومان من ئەوەم دەزانی کە شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی چ پلە و پایەیەکی بەرزی هەبوە لای شەهید شێخ عەبدولسەلام و شێخ ئەحمەدی بارزانی. هەر ئەوەش خۆی لە خۆیدا شکۆمەندییەکی بەرز بوو بۆ شێخ عەبدولڕەحمان کە کەس ناتوانێت لەکەداری بکات. لەبەر ئەوە ئامادە نەبووم گوێ لە کەسێك بگرم کە وەك مشەخۆرێك وایە بەسەر مێژووەوە، بێت و بەو شێوەیە قسە بە شەهید شێخی کۆچکردوو بلّێت، بۆیە سەرپشکم کرد لە نێوان ئەوەی یان بێدەنگ بێت یان مالّەکەم جێ بێلّێت، ئەویش مالّەکەی جێ هێشت.

چەندین جار ئەم پرسیارەم لە خۆم کردوە: ئایا ئەو کەسە لە خۆیەوە هاتبوو، یان بنەمالّەی مەلا مستەفا یان یەکێك لە کوڕەکانی ناردبوویان؟! بەلاّم وەلاّمەکەم دەستنەکەوت.

هەندێك کەس هەولّیان دەدا سەبارەت بە رووداوەکانی سالّی ١٩٢٧ راستیەکان بشێوێنن. بۆیە گەڕانەوە بۆ ئەو ماوەیە و بژار کردنی رووداوەکان ئەوە دەردەخات کە ئەوەی روویدا کودەتا بوو بەلاّم سەرکەوتوو نەبوو، ئەوەش بە هۆی هۆشیاریی بارزانیەکان و ئەو رەوشتبەرزیەی شێخی بارزان (شێخ ئەحمەد) هەیبوو. بەوەش پیلانەکە تێکشکاو و سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، ئەوە نەبێت کە کەسایەتیەکی ناوداری بارزان تیایدا شەهید بوو، ئەوەش لە کاتی نوێژدا بوو و لە دواوە بە فیشەکێك شەهیدیان کرد. ئەوەی سەیر بوو ئەو ماوەیەی لە سلێمانی بووم گێڕانەوەیەکی ترم لەو بارەیەوە بیست کە دەدرایە پالّ مەلا مستەفا دەلّێت:

شێخ عەبدولڕەحمان لەگەڵ خزمێکی خۆی ناکۆکیی هەبوە، بۆیە داوای لێ کردوە کە لەسەر شاخی شیرین بەرامبەری بوەستێت و هەر یەکێکیان تفەنگەکەی خۆی هەڵبگرێت و دەبێ روبەڕووبونەوەکە بە مردنی یەکێکیان کۆتایی پێ بێت. ئەو روبەڕوبونەوەیە لەسەر شاخەکە رویداوەو مەلا مستەفا بەرامبەرەکەی کوشتوە.

ئەم بەسەرهاتەم لە شێخ سالار حەفید بیستوە و گوتی مەلای مزگەوتێکی سلێمانی ئەمەی لە زاری مەلا مستەفاوە بیستوە. ئەو کەسەش بەلایەوە ئاساییە کە ئەو بەسەرهاتەم بۆ بگێڕێتەوە ئەگەر من بمەوێت بیبیستم لە خۆیەوە. بەڵام من سوپاسم کردو گوتم نامەوێت ئەو شتە ببیستم چونکە هەر لە بنەڕەتەوە ئەو قسەیە راست نیە. خۆ ئەگەر شتێك هەبێت پەیوەندیی بە شەهیدکردنی شێخ عەبدولڕەحمان بارزانییەوە هەبێ، ئەوا هەر دەبێت پەیوەندیی بەوەوە هەبێت کە بۆچی شێخ عەبدولڕەحمان لە پشتەوە لە کاتی نوێژدا کوژراوە. ئینجا داوام لێ کرد ئەم بابەتە لە کتێبەکەی ئەیوب بارزانی بخوێنێتەوە.

رەفتاری ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە دەریدەخات کە هەموو سیستمی بارزان بە ئامانج گیراوە، شێوازی کارەکانیش دەریدەخات کە ئەم کارانە لە کاری ئاغایەتیی دەوروبەر دەچێت، ئەوانەی لە دەوروبەری بارزان دەستیان دەڕۆیشت. بەڵام ئەو نارەزایەتیەی بە هۆی شەهید کردنی شێخ عەبدولڕەحمانەوە دروستبوو، ئەنجامدەرانی ناچار کرد هەوڵ بدەن ناوی شێخ بزڕێنن، بێ ئەوەی هیچ پاساوێکی راستیان هەبێت، ئەوەش بە مەبەستی شاردنەوەی نیازی راستەقینەیان لەو کارە گوماناویە.

دوای کوشتنی شێخ عەبدولڕحمان بارزانی هەندێك لاوانی گوندی هەسنەکا کە دەکەوێتە باکوری بارزانەوە، ویستبوویان تەرمی شێخ لە گوندەکەی خۆیان بنێژن، بەڵام تەنانەت ئەوانەش کوژران، لە کاتێکدا کە شێخ ئەحمەد دور خرابۆوە بۆ باشووری عیراق. ئەو کارەش لەسەر دەستی یەکێك لەوانە ئەنجام درا کە لە کوشتنی شێخدا بەشدار ببوو.

ئەو لاوانە بە بەرچاوی دایکیانەوە کوژران، دایکەکەش دوای کوژرانی کورەکانی شێت بوو و کەوتبوە دەشت و هەردو چۆڵ.

ئەوەی تێبینی دەکرێت ماوەیەك دوای تیرۆرکردنی شێخ عەبدولرەحمان یەکێك لە بەشداربوانی ئەو تاوانە لە ژێر کاریگەریی ئازاری ویژداندا خەون دەبینێ، دەیگوت لە خەونمدا پێم دەڵێن ئەو تاوانەی ئێوە ئەنجامتانداوە زۆر قێزەون و گەورەیە و هیچ رێگەیەکیشتان نیە بۆ داوای لێخۆشبوون لەو تاوانە مەگەر ببن بە جولەکە یان گاور.

لەو ماوە کورتەی دوای تیرۆر کردنی شێخ عەبدولرەحمان بارزانی و دورخستنەوەی شێخ ئەحمەد بارزانی بۆ باشوری عیراق، کە ئیتر نەیدەتوانی کاروباری ناوچەی بارزان بەرێوە بەرێت، ئەوانەی شێخیان کوشتبوو چەندین کاری خراپتریان ئەنجام دا وەك سەربرینی گایەکی ماڵی محەمەد هوکی کە بارزانیەکی بە ئەمەك بوو، ئەوەش بۆ ئەوەی لە رووی ئابورییەوە پەکی بخەن و هەژار بکەوێت، هەروەها ماڵی بارزانیەکی تریشیان بریبوو، پێنج سەد دیناری ئەو کاتەیان دزیبوو، ئەوەش لەو کاتەدا برە پارەیەکی زۆر بوو، بەلام دوایی گێرابوویانەوە. هەروەها سادق بارزانی ناچار کرابوو مێزەری رەش بکاتە سەری، هتد.

ئەم کارانە کە دەویسترێت پەردەی بیرچوونەوەی بەسەردا بدرێت بۆ ئەوەیە نەوەی نوێ بێ ئاگا بێت لە یەکێك لە گەورەترین کەسایەتیەکانی بارزانی.

## ژیانی هەندەران

لە بەهاری ١٩٧٦ بە فرۆکە گەیشتینە ڤیەننا. لەوێ گواسترینەوە بۆ کامپی ترایسکیرخن کە تایبەت بە پەنابەرانی فرە رەگەز بوو، هەندێکیان داوای پەنابەرێتیان لە نەمسا دەکرد و هەندێکی تریشیان نەمسایان وەك پردێکی پەرینەوە بەکار دێنا، بۆ ئەوەی بگەنە شوێنێکی تر وەك ئەمریکا. دەرکەوت کە بەرپرسانی کامپەکە لە بارەی رەفتاری کوردەکانەوە ئاگادار کرابوونەوە کە گوایە ئەوانە گەلێکی ئاژاوەگێرن و حەزیان لە ئاشوب و شەرە چەقۆیە.

کاتێك ئەم هەواڵەم پێگەیشت بە پێکەنینەوە گوتم: ئەوە زێدەڕۆییە، بەڵام بە هەر حاڵ ئێمە لێرەدا هەر یەکێکمان باڵوێزی وڵاتانی خۆمانین و دەبێت بە شێوەیەکی جوان رەفتار بکەین بۆ ئەوەی ئەو بۆچونە خراپەی ئەوان هەیانە، لەسەر خۆمانی بسڕینەوە. بەڵام ئەو روداوانەی دوایی روویاندا لە سەردەستی کوردان و بەتایبەتی لەسەر دەستی ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەو بۆچونانەی پشتڕاست کردەوە کە پێشوەختە ئەوان هەیانبوو.

زانیارییەکانی گەلی ئەڵمانیا تا ئەو کاتەش بنیاتنرابوو لەسەر رۆمانەکانی کارل مای، کە لە نوسینەکاندا داهێنانی جوانی کردبوو لە نوسینی چیرۆکی خەیاڵی سەبارەت بە چەندین ناوچەی دورە دەستی جیهان، کە لە ژیانیدا نەیبینی بوون، یەکێك لەو رۆمانانە ناوی (تێپەڕێن بە کوردستانی دڕدا) بوو.

لە کامپی ترایسکیرخن دەرکەوت چەند گروپێکی بچوك دروست بووە کە رەخنە لە هەندێك شت دەگرن و پێیان خۆش نیە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان سەرو سەودایان هەبێت هەندێکیان بێ دودڵی ئەو حزبانەیان بەخیانەت تاوانبار دەکرد. کۆمەڵێکی کەمیش هەبوون هاوسۆزی جەلال تاڵەبانی بوون. هەندێکیشیان ئامێرێکی کۆنی چاپیان دەست کەوتبوو، شتیان پێ چاپ دەکرد. ئەوە سەرەتای شەڕو پێکدادانەکان بوو لە قۆناغی یەکەمدا.

لە ترایسکیرخن ئەندازیار شێروان رەشیدم ناسی کە خەڵکی سلێمانی بوو. پێی راگەیاندم نێردراوێك لە لایەن جەلال تاڵەبانیەوە هاتوە و دەیەوێت بمبینێت. ئێمەش شوێنی نیشتەجێبوونەکەی ناو کامپەکەمان بەجێهێشت و رۆیشتینە ناوچەیەکی دارستانەوە، لەوێندەر ئەندازیار شێروان رەشید پێی گوتم: عەبدولسەوور ئەوە نەوشیروان مستەفایە، نوێنەری جەلال تاڵەبانییە. من لەوێوە کاك نەوشیروانم ناسی.

نەوشیروان بە هێمنی بۆی رون کردمەوە کە تاڵەبانی دەیەوێت هەڵوێستی ئایندەیی بزوتنەوەکە بزانێت. منیش بەکورتی ئەو رێککەوتنەم بۆ باس کرد کە لەگەڵ مەلا مستەفا و دوو کوڕەکەی ئەنجامم داوە، کە دەبێت رێ بگیرێت لە دوبارە بوونەوەی ئەو مەینەتی و کوشتارەی لە رابوردودا روویانداوە. ئینجا

داوام لێ کرد سڵاوی من بە تاڵەبانی بگەیەنێت. بێگومان من بڕوای تەواوم بەوە هەبوو کە رێکەوتنەکەم لەگەڵ مەسعود جێی خۆی دەگرێت و ئەوان جێبەجێی دەکەن، بۆیە بەو شێوەیە وەڵامم دایەوە.

لە ترایکسیرخن کەسێك هات بۆ لام و پێی گوتم: مەسعود دەیەوێت بزانێت بۆچی نامەی بۆ نانێریت؟

لەو کاتەدا نیشانەکانی ناکۆکی بەرەو هەڵکشان دەچوو، هیچ شتێکیش لە ئاسۆوە دەورنەکەوتبوو کە ئاماژە بێت بۆ ئەوەی مەرجەکانی رێککەوتنەکەی کەرەج جێبەجێ دەکرێت. منیش گوتم: شتەکان وەك ئەوە ناڕۆن کە چاوەڕوان دەکرا. منیش ئامادە نیم نامە بۆ کەسێك بنوسم کە نازانم ئامانجەکانی چین. ئینجا مەسعود دەبێت راستەوخۆ قسەم لەگەڵ بکات. من پێویستم بە نێوەندگیر نیە.

## مۆدلینك

دەسەڵاتدارانی کامپەکەمان بڕیاریاندا ژمارەیەك پەنابەری کورد بنێرن بۆ کامپی مۆدلینك، کە شارێکی نزیك لە ڤیەننایە. کامپی مۆدلینگ لە کامپی تریسکیرخن پاکتر و خاوێنتر بوو. وێڕای ئەوەی خواردنیان باشتر بوو. لە هەردوو کامپەکە بەرپرسەکان دەیانزانی موسڵمانین، بۆیە ئەو ژەمانەی دەیاندایني گۆشتی بەرازی تێدا نەبوو.

لە مۆدلینك خولێك بۆ فێربوونی زمانی ئەڵمانی کرایەوە، ئەوەش بەلای منەوە شتێکی زۆر باش بوو، چونکە ئەگەر ئێمە لێرە بژین، ئەوە دەبێت فێری زمانی خەڵکەکەیشی ببین نەك چاوەڕێی پێچەوانەکەی بکەین. بەڵام بەشداربوانی خولەکە بە تەواوەتی کردیان بە گاڵتەجاری، چونکە هەندێکیان بەردەوام خۆیان دەدزیەوەو نەدەهاتن بۆ وانەکان. ئەوانە سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوون. هەر رۆژێك کۆمەڵێکیان نەدەهاتن و رۆژی دوایی دەهاتنەوە داوایان دەکرد وانەکەیان بۆدوبارە بکرێتەوەو ئەوانی تریش

پشتگیرییان لێ دەکردن. دوبارەبونەوەی ئەم حاڵەتە وای کردبوو سودبینین لەو وانانە مەحاڵ بێت، بۆیە ناچار بووم تەسجیلێك بکڕم و هەندێك کاسێتی گۆرانیی ئەڵمانیم کڕی و دەستم کرد بە خۆ فێر کردن، بە سود بینین لەو بابەتانەی لە خوێندنەکە وەرم گوتبوون، ئەو هەوڵانەشم بەرهەمی باشی هەبوو. من یەکێك بووم لەوانەی کە بە خێرایی فێری زمانی ئەڵمانی بووم ئەگەر نەڵێم خێراترین خوێندکار بووم لە فێربووندا.

لە بەرامبەریشدا کەسێکمان لەگەڵ بوو دوای حەوت ساڵ توانی بڕوانامە بەدەست بێنێت ئەویش بە تکاو پاڕانەوەو نێوەندگیری. ئەو مامۆستایەی تکامان لێ کرد بۆ ئەوەی بڕوانامەی بداتێ، خانمێك بوو دەیگوت: خودایە، ئەم کەسە ئاژەڵە، چۆن داوام لێدەکەن بڕوانامەی بدەمێ!!

لە مۆدلینك داوام لێ کرا چاوپێکەوتن لەگەڵ هانس هانز بکەم، ئەو پیاوەی دواجار کتێبێکی لەسەر کورد نوسی وکارمەندێك بوو لە دەزگای پۆلیسی نەمساو دواتریش بووە بەرپرسی پەیوەندییەکانی کورد– نەمسا.

هانز لە شوقەکەی خۆی پێشوازیی لێکردین، من کاك حەلیمم لەگەڵ بوو، ئەویش کوردێکی خەڵکی سوریا بوو، شوقەکەی هانز لە گۆڕەپانی سەربازی سۆڤێتی بوو لە ڤێننا.

هانس هانز پیاوێکی دەم بە پێکەنین و خۆشەویست بوو، بەڵام دواجار ئەو خزمەتی دەوڵەتی خۆی دەکرد.

لەو دیدارەدا بە کورتی باسی پرسی کوردمان کرد ئینجا پرسیارێکی کرد: بەڕێز بارزانی، جەلال تاڵەبانی لە هۆتێل ئینتەکۆنتینتاڵ دابەزیوەو دەیەوێت بتبینێت، تۆ چی دەڵێیت؟

منیش گوتم بە تاڵەبانی بڵێ شوێن و کاتی بینینەکە دیاری بکات من لەوێ دەبم. هانز بەلایەوە سەیر بوو بەو شێوەیە وەڵامم دایەوە، هەندێك بیری کردەوەو جارێکی تر پرسیارەکەی دوبارە کردەوە، منیش هەمان وەڵامم دایەوە!

لێرەدا هانز پرسی: بەڵام بەڕێز بارزانی، سامی لە ڤیێننایەو ئامادە نیە تاڵەبانی ببینێت. ئەم دو هەڵوێستە جیاوازەتان چ مانایەك دەگەیەنێت؟

پێش هەمو شتێك لە هاوزەر بیستم کە سامی لە ڤیێننایەو هەڵوێستێکی پێچەوانەی ئەو ڕێکەوتنەشم بیست کە لەگەڵ مەلا مستەفاو کوڕەکانی بەستبوم لە کەرەج.

منیش بەم شێوەیە وەڵامم دایەوە: ئەوەی دەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە هەڵوێستەکەی من بنیاتنراوە لەسەر ڕێکەوتنێکم لەگەڵ مەلا مستەفاو کوڕەکانی. سەبارەت بە سامی و ئەو هەڵوێستە گرتوێتی نازانم هۆکارەکانی چین!

ئەو گوتی: هەڵوێستەکەی تۆ ڕاستەو کوردان دەبێت بەو شێوەیەی تۆ مامەڵە بکەن، ئەمجارەش ڕوی گەشایەوە. ئینجا پێشنیاری کرد کە دیدارێك لەگەڵ پەرلەمانتارێك لە پارتی سۆسیالیستی نەمسا بکەم، کە ناوی دکتۆر هانیس فیشەرو ئێستا سەرۆکی کۆماری نەمسایە.

لەو ماوەیەدا هەواڵێك بڵاو بۆوە کەگوایە سەرکردایەتیی کاتیی پارتی پێکهێنراوە، پێش ئەوەش یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە سەرکردایەتی جەلال تاڵەبانی ڕاگەیەنرا بوو. لەو ماوەیەدا هەندێك زانیاری بڵاو ببۆوە هەمووی ئەوەی دەگەیاند کە پاشماوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە قیادە موقەتەدا خۆیان ڕێکخستبۆوە هەندێك هەڵوێستی خۆی لە چەند ڕستەیەکی کورتدا ڕوونکردۆتەوە کە هەموو هەڵوێستی وێرانکارین، بەم شێوەیە:

ئەگەر جەلال تاڵەبانی شۆڕش بکات ئێمە دەبین بە جاش!

ئەگەر نەتوانین سەرکردایەتیی شۆڕش بکەن دەتوانین تێکی بدەین!

هەروەك دەرکەوت، زۆربەی ئەوانەی لە قیادە موقەتە بوون ئەندامی پێشووی دەزگای (پاراستن) بوون، لێرەشەوە جێ پەنجەی مەسعود بە تەواوەتی دیار بوو. هەر لەوێشەوە پروپاگەندەیەك بڵاو بۆوە کە گوایە مەسعود نیو ملیۆن دۆلاری داوە بە سامی کاتێك لە تارانەوە ڕوویکردۆتە ئەوروپا.

هەموو ئەوانەش ئەوەیان دەگەیاند کە مەلا مستەفاو کوڕەکانی دیسان دوڕوو بوون. رویەکیان پیشانی من داوە کە لەگەڵ دونیابینیەکانی خۆمدا دەگونجێت، روەکەی تریشیان پیشانی سامی و هاوشێوەکانی داوە بە ناوی قیادە مۆقەتەوە، کە ئەویش لەگەڵ مەیلە راستەقینەکان و نیازە شاردراوەکانیان، دەگونجێت.

بیرم دێت لەو کاتەدا لە لایەن دکتۆر محەمەد ساڵح دمۆکیەوە ئاگادارییەکی برایانەم پێگەیشت. ئەو کاتە ئەو خوێندکاری دکتۆرا بوو. ئەو هەستی بەو جیاوازییە گەورەیە کردبوو کە لە نێوان تێڕوانینەکانی هەردولادا هەیە، بۆیە لە هۆکاری ئەو جیاوازیەی دەپرسی. منیش باسی رێکەوتنەکەی کەرەجم بۆ کرد. بەڵام محەمەد ساڵح دەستی کرد بە پێکەنین گوتی: عەبدولموسەور هەڵوێستەکەی سامی هەڵوێستی راستەقینەی مەلا مستەفاو کوڕەکانیەتی، بەڵام هەڵوێستەکەی تۆ تەنیا گوزارشت لە خۆت دەکات و هیچی تر، دەشبینیت ئەوان پشتی سامی دەگرن نەك تۆ.

لێرەدا کە ئیدی گومانم زۆر بوو لەسەر ئەوەی مەسعود بە فرۆفێڵ و تەڵەکەبازییەوە رەفتار دەکات، بڕیارم دا بێلایەن بم و خۆم لە هیچ کارێکی حزبییەوە نەگلێنم، بەتایبەتی پاش ئەوەی بینیم ئەو کەسانەی مەسعود وەك کەسانی متمانە پێکراو باسی دەکردن کە گوایە دەتوانرێت لە هەر هەلومەرجێکدا پشتیان پێ ببەسترێ، هەر ئەوان بوون ناشیرینترین جنێویان بە بنەماڵەی مەلا مستەفاو ئیدریس و مەسعود دەدا، بە شێوەیەك کە مرۆڤ ناتوانێت باوەڕ بکات، بێگومان جنێودانەکانیش بە رۆژی رووناك بوون.

ئەو بەزمەش خەریك بوو جارێکی تر لە کێشەیەکی تر تێوەگلێین. بە هۆی توڕەبوونی خەلیل ئیبراهیم بارزانیەوە کە کاردانەوەی توندی هەبو لەسەر ئەو جنێو و رەفتارانەی کە پێگەی مەلا مستەفایان لەکەدار دەکرد و بە ناشیرینی باسی خێزانەکانیان دەکردن، خەریك بوو لەگەڵ سەلام بەرواری شەڕ دروست بێت ئەویش بەهۆی ئەوەی قسەی بە ئیدریس وتبوو. بەڵام من رێگریم لێکردو پێم گوت: خەلیل، لەسەرەخۆ بزانە لەگەڵ کێ شەڕ دەکەیت، زۆربەی ئەوانەی

پاڵیان داوە بەو حزبەوە بە هەمان شێوە رەفتار دەکەن. تۆ دەتەوێت شەڕ لەگەڵ هەموان بکەیت؟ ئەم شەڕە شەڕێکی دۆڕاوە چونکە ئەوانە نوێنەرایەتیی بنەماڵەی مەلا مستەفا دەکەن.

لەو ماوەیەدا نامەیەکم بۆ مەسعود نوسی. نامەکە شەش لاپەڕە بوو. رەوشەکەم وەك خۆی بۆ شرۆڤە کرد بوو، ئاماژەم بەوەش دابوو کە ئەو کەسانەی جێی متمانەت بوون رەفتارو هەڵسوکەوتیان زۆر سووك و چرووکە.

ئەوەی سەیرە سامی دوای ئەوەی لە بنەماڵەی مەلا مستەفا جیا بۆوە، کتێبێکی بڵاو کردەوە و تیایدا هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەو بنەماڵەیە دیاری کرد. هەر لە کتێبەکەدا نامەکەی منی بڵاو کردبۆوە. ئاماژەی بەوە کردبوو کە هەر لە بنەڕەتەوە حەزی بەوە نەبوە لەگەڵ بنەماڵەی مەلا مستەفادا کار بکات بەڵام لەبەر ئەوەی پێویستی بە پارە بوە، ناچار بوە کاریان لەگەڵ بکات چونکە هەرچی پارەیە لە ژێر دەستی ئەواندا بوە. ئەمیش ناچار بوە بێدەنگ بێت. بێگومان بنەماڵەی مەلا مستەفاش ئەو کتێبەیان خوێندۆتەوەو دواجار راستیی هەڵوێستەکانیان بۆ دەرکەوتوە، بەڵام دوای زەمانێکی درێژ نەك لە کاتی روداوەکاندا.

من زیاتر شارەزای سەوداکانی سامی بووم کە لە ڤیەننا بە رێکەوت بینیم. ئەم بینینە لە ریستۆرانتی ڤینەر ڤالد بوو لە نزیك کێرینتەر شتراسە لە ناوەڕاستی ڤیەننا، کاتێك چووینە ریستۆرانتەکە بۆ نانخواردن سامیش لەوێ بوو. بانگی کردین تا لەسەر مێزەکەی ئەو دابنیشین. لە ناکاو بێ هیچ پێشەکیەك هێرشی توندی کردە سەر ماڵی مەلا مستەفا و گاڵتەی بە باوك و کوڕەکانی (ئیدریس و مەسعودو عوبەیدوڵڵا) کرد. دوای ئەوان چوە سەر عەزیز ئاکرەیی و بە درێژایی کاتەکەش پێدەکەنی!

من پێم گوت: بۆ وا هەڵوێستەکانت گۆڕیوە، تۆ لەوێ بە ئەزبەنی بانگیان دەکەیت و لێرەش گاڵتەیان پێدەکەیت!

بەڵام دوای ئەوە هەندێك لەوانەی سەر بە قیادە موەقەتە بوون بۆیان باسکردم کە ئەو پیاوە بەرزە چۆتە لەندەن و لەوێندەر پروپاگەندەیەکی بڵاو کردۆتەوە کە گوایە من بە ئامادەبوونی سامی جنێوم بە مەلا مستەفا داوە.

سەرانی قیادە مۆقەتە بە ئاشکرا دەیانگوت: مەلا مستەفا تەواو بوە. پیرێکەو لەگەڵ مەرگدا دەجەنگێت، ئیدریسیش لە حزب دەرکراوەو هیچ رۆڵێکی نەماوە. رێگەش نادەین عەبدولسەوەر خۆی لە سیاسەت هەڵبقورتێنێت، تاکە کەسێك بەلامانەوە پەسەند بێت تەنیا مەسعودە. دواجار روداوەکان دەریان خست کە مەسعود هەندێك کەسی بە زۆر سەپاندوە، ئەمەش بەپێچەوانەی رێکەتنەکەی کەرەجەوە بوو کە بەڵێنی دابوو هەموو شتێك بە هەڵبژاردن بکرێت. بۆیە هەموو هەوڵێکم بۆ رێگرتن لە پەرتبوون بێسود بوو. لە کۆبونەوەیەکدا کە کەسانی سەربەخۆ ئەنجامیاندا لە ژێر زەمینی بترایسکێرخن، هەندێك لەوانەی هەواداری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون، کە کەمینەیەکی کەم بوون و زۆرینە بێلایەنەکان بوون، ئەو بابەتە جارێکی تر باس کرایەوە، جا لەبەر ئەوەی من سور بووم لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردن بۆ ئەوەی پەرتبوون رو نەدات و زۆرینەی ئامادەبوانیش پشتگیریی هەڵوێستەکەی منیان دەکرد، خوالێخۆشبوو فوئاد رەسول بەم رەوشە تەنگاو بوو تەنانەت کاغەزەکانی دەستی فرێدا، بەڵام دواجار بیرۆکەی هەڵبژاردن سەرکەوت.

بەڵام قیادە موەقەتە کۆبونەوەکەیان جێهێشت و رایانگەیاند کە ئەوان کۆبوونەوەی تایبەت بە خۆیان ئەنجام دەدەن.

لێرەدا دەبینین هەموو لایەنەکان لەوە تێگەیشتبوون کە دەبێت پەنا ببرێت بۆ هەڵبژاردن، تەنانەت یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش، کە لەو کاتەدا کەمینەیەکی کەم بوون. تەنیا قیادە موەقەتە نەبێت، بەمەش جارێکی تر رێکەوتنەکەی کەرەج پوچەڵ کرایەوە چونکە ئەوان رێکخراوێکی قوتابیانی سەر بە خۆیان دامەزراند.

ئەم پێشرەفتە دەرگای کردەوە بۆ بەرامبەریش کە هەمان رێوشوێن بگرێتە بەر. ئەو لایەنەش وردە وردە لە لایەن کەسانی سەربەخۆوە پشتیوانی کران.

ئیدی رکابەریی نا دیموکراتی هەڵکشانی زۆری بەخۆوە بینی، کە دەتوانرا ئەو رکابەرێتیە خامۆش بکرێت ئەگەر میکانیزمی دیموکراسیەت بگیرایەتە بەر، چونکە قیادە موەقەتە بە چەقۆ و تێڵا پەلاماری خەڵکەکانی تریان دەدا لە نەمسا. ئەمەش بە هێواشی گەیشتە ئەوەی لە کوردستان پەلاماری چەك دژی یەکتر بدەن. ئەوەش ئەو شتە بوو کە من لە کەرەج مەسعودم لێ ئاگادار کردەوە.

بەم شێوەیە مەسعود هەموو خاڵەکانی رێکەوتنەکەی کەرەجی بە ئەنقەست و بە پیلانی پێشوەخت پوچەڵ کردەوە. ئەوەی سەیر بوو هەموو جارێك کە لەگەڵ کەسێکی سەر بە قیادە موەقەتە قسەم دەکردو دەمگوت ئەم رەفتارانە زۆر خراپن بۆ ناو شۆرەتی کوردو پێویستە واز لەو کارانە بێنن، وەڵامەکانیان زۆر نامۆ بوون. ئەوان رێك ئەوەیان دەویست. دەیانویست گۆڤار و رۆژنامەکان لەسەر نەیارەکانیان نێگەتیڤانە بنوسن. دوای چەند ساڵێك بۆم دەرکەوت کۆمەڵێك نەفس نزم کە حەزیان بە دواکەوتوویی بوو پەنایان دەبردە بەر ئەو کارانە بۆ ئەوەی مەرجەکانی خۆیان بسەپێنن بەسەر ئەوانی تردا و سەرپشکیان بکەن لە نێوان پەسەندکردنی مەرجەکانیان، یان (روخاندنی هەموو شتێك).

لەو کاتەدا ئیتر زانیم داخوازیەکانی من بە هیچ شێوەیەك نایەنە دی و روانگە سیاسیەکانم بەدی نایەن. بە زمانی عەرەبی نوسراوێکم نارد بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵای نەمسا. ئێستاش بیرم دێت نامەکەم ئەم برگەیەی خوارەوەی تێدا بوو (پشتیوانیکردنتان لە خوێندنی پەنابەرانی کورد پشتیوانیکردنە لە پرسی گەلێکی چەوساوەو کێشەیەکی رەوا). کاتێکیش نیازەکەی خۆم لای پەنابەران باسکرد، کەسانێکی کەم نەبێت ئیتر کەسی تر حەزی بە خوێندن نەدەکرد.

ویستمان نوسراوەکە وەربگێڕینە سەر زمانی ئینگلیزی، بەڵام دواجار بۆمان دەرکەوت کە دەبێت بە ئەڵمانی بینوسین. بۆیە پەنامان بردە بەر کەسێکی

کورد کە لە مێژ بوو لە نەمسا دەژیا، چونکە لەو باوەڕەدا بوین ئەو کەسە ساڵەهایە لە نەمسا فێری ئەلمانی بووە. بەڵام ئەو کەسە ماوەی هەفتەیەك خۆی وون کردو بە زەحمەت بینیمانەوە. کەچی گوتی: ئەم عەریزەیە بە شێوەیەك نوسراوە کە ئەستەمە وەری بگێڕینە سەر زمانی ئەڵمانی!.

لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە لە زمانی ئەڵمانیدا زۆر کۆڵە هەرچەندە ماوەیەکی زۆریشە لەو وڵاتە دەژی. دوای چەند مانگێك پێیان ڕاگەیاندین کە ئەو کەسە پەیوەندیی لەگەڵ باڵوێزخانەی عیراقیشدا هەبوە!

دواجار کەسێك پێشنیاری ئەوەی کرد کە بچین بۆ ئۆفیسێکی وەرگێڕان لە ناو شار. ئێمەش ئەدرەسی ئۆفیسێکمان وەرگرت و بە ئینگلیزی تێمانگەیاندن و عەریزەکەمان پێش کەشکرد.

لە بەختی باشی ئێمەدا گوتیان ئێمە کەسانێکمان هەیە کە زمانی عەرەبی و ئەڵمانی دەزانن و ئەوان بۆتان وەردەگێڕن، دوای چەند ڕۆژێك وەرگێڕاوە ئەڵمانیەکەمان بەدەست گەیشت. منیش سەردانی وەزارەتی خوێندنی باڵام کردو داوام کرد چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیردا بکەم کە خانمێك بوو.

# بەدیهێنانی خەونی خوێندن لە زانکۆ

کاتێك سەردانی وەزارەتمان کرد، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ یاریدەدەرێکی وەزیر ئەنجام دا و بە زمانی ئینگلیزی قسەمان لەگەڵ کرد. سەرنجی ئەوەم دا زۆربەی هەرە زۆری ئەمساوییەکان زمانی ئینگلیزیان نەدەزانی، بەڵام ئەوە گرفت نەبوو چونکە عەریزەکەم بە ئەڵمانی نوسرابوو بۆ ئەوەی خۆم بتوانم بیخوێنمەوە یان لێی تێ بگەم، جا ئایا تەرجەمەکە هەمان ئەو داواکاریانە بوون کە خۆم نوسیبووم بە زمانی عەرەبی یان شتێکی تر بوو، نازانم.

یاریدەدەری وەزیر عەریزەکەی خوێندەوە زەردەخەنەیەکی کرد گوتی: ئێستا بە وەزیر دەڵێم و داواکەشی بۆ باس دەکەم، ئەو لە ژوورەکەی تەنیشتمانە کۆبوونەوەی هەیە.

پاش هەندێك بە ڕو گەشاوەیی گەڕایەوە گوتی: بەڕێز بارزانی، جەنابی وەزیر بەخێرهاتنتان دەکات، بەڵام داوای لێبوردن دەکات کە بە هۆی سەرقاڵییەوە ناتوانێت بتانبینێت، بەڵام فەرمانی دەرکردوە دەستبەجێ داواکانتان پەسەند بکرێت. بەو شێوەیە ڕێگەتان پێدەدرێت بخوێنن لە زانکۆ و بڕێك پارەشتان وەك یارمەتی بۆ تەرخان دەکرێت تاکوو بتوانن درێژە بە خوێندنەکەتان بدەن.

دوای ئەوە بێ دواکەوتن پەیوەندی کرد بە دکتۆر کۆلەر، بەرپرسی کاروباری قوتابیان لە زانکۆی ڤیەننا گوتی: بەڕێز بارزانی لای منە و دەینێرم بۆ لای ئێوە و فەرمانی بەڕێز وەزیر ئەوەیە کە داواکارییەکانی جێبەجێ بکرێت. داوات لێ دەکەم لە دەرەوەی زانکۆ لەسەر پلیکانەکانی دەرەوە پێشوازی لێ بکەیت بۆ ئەوەی زۆر بە شوێنتدا نەگەڕێت لە ناو زانکۆ. منیش زۆر سوپاسم کرد و دوای ئەوە بەرەو زانکۆ بە ڕێکەوتین ئەویش لە وەزارەتەوە نزیك بوو.

کاتێك پەنابەرەکانی تر هەستیان بەوە کرد کە دەرفەتێکی باش هەیە بۆ خوێندن، ئەو دەرفەتەش پارەی لەگەڵدایە ئیدی ژمارەی ئەوانەی داوای خوێندنیان دەکرد بە شێوەیەکی خەیاڵی بەرز بوویەوە، دوای ئەوەی زۆرینەی ئەوانە گاڵتەیان بە مەسەلەی خوێندن دەهات.

ئەوەی سەیر بوو دوای ئەوەی هەمو شتێك تەواو بوو لە لایەن خۆمانەوە پرسیارێکیان کردبوو کە چۆن و کێ ئەو ئەو کارەی ئەنجام داوە، شێرزاد نەجار کە لەگەڵ قیادە مؤقەتە کاری دەکرد گوتبوی ئەو کارە کاری حزبە و لە نهێنییەکانی حزبە. بێگومان ئەوانەی ئاگاداری کارەکان بوون دەستیان بە پێکەنین کرد چونکە دەیانزانی درۆیە.

کاتێك دکتۆر کۆلەر هات بۆ مدلینك بۆ ئەوەی پرسی خوێندن باس بکات، لە کاتی قسەکانیدا ئاماژەی بەوە دا کە دەبێت هەندێك بچن بۆ شاری کراتس لەسەر سنوری ئیتاڵیا. من یەکەم کەس بووم دەستم هەڵبڕی بۆ ئەوەی بچم بۆ ئەوێ، تاکوو رزگارم بێت لەو شەڕ و ئاژاوەیەی مۆدلینك و بتوانم خەریکی خوێندنی خۆم بم و بە زوترین کات تەواوی بکەم.

بەڵام ئەو رەتی کردەوە گوتی: سەبارەت بە تۆ جگە لە خوێندن لە ڤیەننا، هیچ بوارێك نیە.

## یەکەم دیدار لەگەڵ دکتۆر هانیس فیشەر

لە پێشدا باسی ئەوەم کرد کە بەڕێز هاوزەر ئاماژەی دا بەو دیدارە و پێی باش بوو ئەنجامی بدەین، هەر ئەویش کاتی دیدارەکەی بۆ وەرگرتین.

بەیانیەك لە بینای پەرلەمان دیدارەکەمان ئەنجامدا. دیدارەکەمان زۆر باش بوو، چونکە دکتۆر فیشەر خۆی کەسێکی زۆر کراوەیە و باش لە مەسەلەی کورد تێدەگا و هاوسۆزیشە بۆ مەسەلەکە، بەڵکو هاوسۆزی هەموو پرسەکانی ئازادیخوازیە لە جیهاندا. دکتۆر ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ئەوەی لە بازنەی دەسەڵاتەکانی خۆیدا هاوکاریمان بکات. لێرەدا پیشنیاری ئەوەم کرد کە شوێنی نیشتەجێبوونی شیاو بدرێت بە پەنابەرەکان، بەتایبەتی کە دوو

خوشكی خەڵكی سلێمانیمان لەگەڵ بوو. داوام كرد شوقەیەكی تایبەت بە خۆیان بۆ تەرخان بكرێت و وەك خێزانێك هەژمار بكرێن. ئەوانی تر كە تەنیا بوون و گەنج بوون، بەتایبەتی قوتابیەكان، دەشێت لە بەشە ناوخۆییەكان دابنرێن. لێرەدا لێی پرسیم ئەگەر خۆم پێویستم بە شوقەیەك بێت. من گوتم نەخێر پێویستم پێی نیە چونكە نەمویست ئەو دیدارە بقۆزمەوە بۆ سودی تاكە كەسیی خۆم بە پێچەوانەی زۆربەی هەرە زۆری كوردەوە كە پێش هەمو شتێك بیر لەوە دەكەنەوە دەستكەوتی خۆی پێش هەمو شتێك بخەن.

سەبارەت بەو دوو كچەی باسم كردن هەوڵەكانم بۆ ئەوان لەبەر ئەوە بوو زۆربەی خێزانە بارزانیەكانی كەرەج كە دەهاتن بۆ ماڵاوایی كردنم باسی ئەو دوو كچەیان بۆ دەكردم و سوێندیان دەدام كە كۆمەكیان بە گوێرەی توانای خۆم بكەم.

جا لەبەر ئەوەی هەر كە دەرفەتێكم بۆ رەخسا هەوڵمدا بەڵێنەكەی خۆم ببەمە سەر، چونكە من لەو كەسانەم هەرچیەك بڵێم دەبێت بەجێی بێنم.

دواجار هەواڵەكەم بە یەكێك لەو دوو كچە گەیاند. وا دیار بوو لە رێگەی ئەویشەوە وا بڵاو ببۆوە كە هەر خێزانێك شوقەیەكی پێدەدرێت، بەڵام ئەمجارەیان بەختم هەبوو قیادە مۆقەتە بانگەشەی ئەوەی نەكرد كە ئەوان ئەو كارەیان كردوە.

پەیوەندیم لەگەڵ دكتۆر هانیس فیشەر بە باشی مایەوە. لە راستیدا ئەو پیاوە لەو جۆرە كەسانە بوو كە دەبوو مرۆڤ هەوڵ بدات هاورێیەتی بكات چونكە هەر هاورێیەتی ئەو پیاوە خۆی لە خۆیدا سەرمایەیەكی گەورە بوو، هەر بە راستیش ناسینی ئەو وەك دەرفەتێكی زێرین سەیر دەكەم تا ئێستاش جێگەی رێزو پێزانینی منە. ناسینی هەندێك كەس هەمیشە دەستكەوتە، چونكە خاوەن بەهای باڵان.

هەروەك چۆن پەیوەندیم لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێران باش بوو، لێرەش پەیوەندیم لەگەڵ دەسەڵاتی نەمسا باش بوو و بەرەو پێش دەچوو، بەڵام دەستێوەردانی پارتی دیموكراتی كوردستان دوو جار رەوشەكەی تێكدا.

من توانیم پشتیوانیی ئەوان وەربگرم بۆ ئەوەی مامۆستایەك بۆ منداڵە کوردەکان دابمەزرێنین تاکو فێری زمانی کوردییان بکات و زمانەکەی خۆیان بیر نەچێتەوە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانم بوو، ئەو شتەی من وەك دەستکەوتێك سەیرم دەکرد، لە لایەن قیادە مۆقەتەوە بە هەند وەرنەگیرا، بەڵکو دەیانگوت لەبەر ئەوەی قوتابخانەکە لە لایەن عەبدولمسەوورەوە دەکرێتەوە ئێمە نامانەوێت!

دوای ئەوەیش دەرفەتێکمان بۆ رەخسا بۆ ئەوەی بە زمانی کوردی بەرنامەیەك لە رادیۆیەکەوە پەخش بکەین، سەبارەت بە ژیانی کوردەکان و پێشرەفتە سیاسیەکان. من لەو باوەڕەدا بووم کە ئەوە هەنگاوێکی باشەو لە رووی راگەیاندنەوە دەکرا دواتر هەنگاوی باشتری لەسەر بنێین، ئینجا ئەم ئیشە بایەخێکی تریشی هەبوو، چونکە لەو کاتەدا رەوەندێکی کوردی باکور لە نەمسا هەبوون کە زیاتر لە ٣٠٠٠٠ کەس دەبوون لە نەمسا دەژیان.

ئەوە لە کاتێکدا لە هەندێك وڵاتی تری ئەورووپیدا ئێزگەی لەو شێوەیە هەبوو کە چەند ساڵێك دوای پێشنیارەکەی ئێمە دامەزرا بوون، هەروەها بیرۆکەی فێرکردنی زمانی کوردی بۆ منداڵە کوردەکان دوای چەند ساڵێکی تر لە نەمسا پراکتیزە کرا، بەڵام لەو باوەڕە دام کە کوردانی تورکیا زیاتر سودیان لەو خوێندنە وەرگرتوە.

لەبەر ئەوەی قیادە مۆقەتە بەردەوام بوون لەسەر دروستکردنی گیرو گرفت و کێشە نانەوە، لە کۆتاییدا رێگر بوون لە بەردەم درێژەدان بە کارەکانمان کە دەکرا کاری زۆر باشتر بکەین.

کاتێك لە مۆدلینك بووین هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە ئەو زەمالەتەی مەسعود لە نەغەدە ئاماژەی پێدا، گەیشتوە و ناوی منیش یەکەم ناوە لە لیستەکەدا. بەڵام کاتێك هەندێکیان لەوانە نارد بۆ بەلجیکا ناوی منیان سڕی بۆوە. !

هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی قیادە مۆقەتە بەرامبەر من لە چەندین شتی تردا دەردەکەوت، لەوانە کاتێك ئەحمەد پیرۆت، کە کارماند بوو نامەیەکی بۆ هێنام

بۆ ژوورەکەی خۆم، گوتی ئەمە بۆ تۆ هاتوە. بینیم نامەکە کراوەتەوە، گوتم ئەوە بۆ کراوەتەوە. ئەو شانی هەڵتەکاند و گوتی نازانم. منیش یەکسەر دابەزیمە خوارەوە بۆ لای کارگێڕی کامپەکە و پێم گوت جیاوازیەك هەیە لە نێوان پەروەردەی خۆرهەڵاتی و پەروەردەی دیموکراتی لە خۆراوادا، خۆراواییەکیان نامەی خەڵك ناکەنەوە بەڵام خەڵکی خۆرهەڵات ئەو ئاستە رۆشنبیرییەیان نیە و کەسانێکیان هەن کە ئەو ئەتوارانە دەنوێنن، لەبەر ئەوە پێویستە نامەی خۆم بدرێتە دەست خۆم نەك کەسێکی تر. بەڵام خانمەکەی لەوێ دانیشتبوو بە شەرمەوە پێی گوتم هیچ کەسێك لە فەرمانگەکە ناتوانێت نامەی کەسی تر بکاتەوە چونکە ئەمە سزای یاسایی لەسەرە. منیش پێم گوت: دەزانم تۆ راست دەکەیت خۆ تۆ هەر تێی ناگەیت چونکە بە زمانی عەرەبی نوسراوە، بەڵام پێم گوت لە ناو خۆماندا کەسانێك هەن شتی وا دەکەن، لەبەر ئەوە پێویستە نامەکانم بدرێنە دەست خۆم.

## سەردانی شاندێك لە ئە نجومەنی یاسادانانی ئۆتۆنۆمی

لەو ماوەیەدا پێیان راگەیاندین کە ژمارەیەك کوردی عیراق گەیشتونەتە نەمسا و دەیانەوێت زۆرترین ژمارەی پەنابەران رازی بکەن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ عیراق، ئەوەش بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە کورد لە عیراق توشی چەوسانەوە و ئازاردان نەبووە. لە راستیشدا هەندێك لە کوردەکان تەنانەت پێش ئەو سەردانەش پەیوەندییان بە باڵیۆزخانەی عیراقەوە هەبوو، بەڵکو هەندێکیانم دەبینی کە ئۆتۆمۆبێلی باڵیۆزخانە لێدەخوڕن. یەکێك لەوانەی هاتبوو بۆ نەمسا فارس باوە بوو کە ئامر هێزی پێشووی دەشتی هەولێر بوو.

لەو کاتەدا سەعدی ئەحمەد پیرە لێی پرسیم حەز دەکەیت فارس باوە ببینیت؟ گوتم بەڵێ، بەڵام لە شوێنێکی قەرەباڵغ و بە رۆژ، هەر واشمان کرد. لە چایخانە و ریستۆرانتێك لە شەقامی ماریا هیلفەر شتراوە دیدارەکەمان ئەنجام دا. من بۆ جاری یەکەم لە سەرەتای حەفتاکاندا فارس باوەم دیبوو ئەو کاتەی جەمیل محەمەد ئاغای مێرگەسۆری لە هەولێر تیرۆر کرا، من لەوێ ئەفسەری

پۆلیس بوم من هەوڵمدا موجامەلەی بکەم و دوایی بە خۆشی لێك جیا بووینەوە.

دوای ماوەیەك رەفتاری خراپ لە ناو کامپی پەنابەران هەڵدەکشا، دەستدرێژی کردنە سەر یەکتر بە چەقۆ و تێلا لە لایەن ئەندامانی قیادە مۆقەتەوە دژی ئەوانی تر کە لە ریزەکانیان دەرچوو بوون، بەڵکوو تەنانەت ئەوانەش کە لەگەڵ خۆیاندا بوون، زیادی کرد، وەك دوو جار دەستدرێژیکردنە سەر حسێن عەلی باوە. من لە خەستەخانە سەردانم کرد، هەروەها حسێن سنجاری پەنای بۆ هێنام و سکالای کرد لەوەی ئەندامانی قیادە مۆقەتە هەرەشەی لێ دەکەن بەوەی شەرەفی ژنەکەی ئەتك دەکەن... هتد.

هەڵوێستی من لە ئاست ئەم شتانە هەندێك موحافیزکارانە بوو. پێم وابوو دواجار ئەم رەفتارانە زیان دەگەیەنن بە بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد چونکە دەبنە هۆی خوێنرشتنی بەناهەق و ئاگری ئاژاوە خۆش دەکەن بەلام کێ گوێت لێدەگرێت.

بێگومان ئەو رەفتارە ناشیرینانە دواجار بە خراپی بەسەر ناوی کوردا لە نەمسا شکانەوە، ئەوەش ئەو شتە بوو کە من چەندین جار خەڵکم لێ ئاگادار دەکردەوە، بەلام بێسوود بوو. لە راپۆرتێکدا کە کاربەدەستێکی وەزارەتی ناوخۆی نەمسا نوسیبووی، زۆر بە خراپی باسی پەنابەرانی کوردی کردبوو.

هەروەها ئەم ئەزمونانە تێیان گەیاندم و زیاتر فێریان کردم خۆم بپارێزم. لە ئاستی ناکۆکییەکاندا، ئەوان هیچ هەست بە تاوان ناکەن کاتێك دەبنە هۆی گیان لەدەستدانی هەزاران کەس و هەندێکیان سوکایەتی وا بە یەکتر دەکەن کە ئەقڵ بە خەیاڵیش پەی پێ نابات، کەچی دوای ماوەیەك پێکەوە دادەنیشن و وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێت و دواتریش خولێکی تری شەڕ دەست پێ دەکەنەوە بێ ئەوەی پەند لە هەڵەکانی رابوردو وەربگرن.

لە راستیدا بەرژەوەندیی تاکە کەسی و کورتبینی و نەبوونی دیدێکی روون، کاروباری سیاسیی کوردان بەرێوە دەبات نەك سوربوون لەسەر بەرژەوەندیی نەتەوەیی کورد.

# هەوڵێکی ترسنۆکانە بۆ تیرۆرکردنم

پێدەچێت هەڵوێستەکانم و دەستکەوتە خێراکانم هەندێ کەسیان توشی شۆك کردبێت بەتایبەتی ئەوانەی لە سیاسەتدا بەس کوشتن و پیلانگێڕی دەزانن، چونکە حەسودی هەندێك جار پیاو دەکوژێت، بەتایبەتی ئەگەر دواکەوتوو و دەسەوسان بێت. هەموو ئەو شتانە پاڵی بە قیادە مۆقەتەوە نابوو بۆ ئەوەی هەوڵی تیرۆر کردنم بدەن. من و بارزانییەکی تر بە ناوی خەلیل ئیبراهیم لە کامپی مۆدلینك پەلامار دراین و مەبەستیش ئەوە بوو من بکوژن ، لە راستیدا رزگاربوونم لەو هەوڵە تیرۆریستیە وەك موعجیزەیەك دەبینم. لەبەر هۆیەك کە خۆشم نازانم چیە، خوا ویستی تەمەنم درێژتر بێت بۆ حیکمەتێك کە هەر خوا دەیزانێت. هەزاران جار لە خۆم پرسیوە: چۆن و بۆچی رزگارم بوو؟ ئەوروپییەکان دەڵێن هەموو روداوێك هۆیەکی خۆی هەیە کە زۆر جار لە خەڵك ناشارێتەوە چونکە حیکمەتێکی خودایی تێدایە !

ئەوەش بە دور نازانم کە هەندێك لەوانەی سەر بە باڵوێزخانەی عیراق بوون لەو کارەوە تێوە گلابن، ئەوەش شتێکی سەیر نیە چونکە پارتی دیموکراتی کوردستان بە تایبەتی و حزبە کوردییەکان بەگشتی هەمیشە لینکیان لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتانی تردا هەیە، تەنانەت عەبدولجەبار کوبەیسی کە بەعسیەکی سەر بە باڵی سوریا بوو پێی گوتم: عەبدولمسەور بۆچی حزبە کوردییەکان تەنیا دەتوانن لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکاندا کار بکەن؟!

سەبارەت بە پاساو هێنانەوە بۆ ئەم هەڵوێستە ترسنۆکانەیە، هەندێك لە کادیرەکانی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان چەند پاساوێکیان دەهێنایەوەو لە ناو خەڵك بڵاویان دەکردەوە گوایە:

١-داوامان لە عەبدولمسەور کردووە لە بەرژەوەندی ئێمە شت بنوسێت بەڵام رەتی کردۆتەوە ئەوەش ئەنجامەکەیەتی! لە راستیدا ئەو قسەیە راست بوو

چونکە من رازی نەبووم لە هەندێك شەڕە قسەوە بگلێم کە تاکە ئامانج تیایاندا ئەوە بوو لاوانی کورد تیژ بکرێنەوە بۆ ئەوەی بە خۆڕایی لە ناکۆکیە خوێناوییەکانەوە بگلێن.

بەڵام لێرەدا دەبێت بپرسین: ئایا حزبێك خۆی بە دیموکراتی بزانێت رەفتاری وا دەنوێنێت؟ جا ئایا ئەگەر کەسێك ئەوە رەت بکاتەوە کە یاری بە ئەقڵیی خەڵك بکات و دژی تێوەگلانیان بێت لە شەڕی ناوخۆدا، پاداشتی ئەوەیە کە دەبێت بەو شێوە نزم و ناشیرینە تیرۆر بکرێت؟

٢-عەبدولمسەوور کار ئاسانی کردوە بۆ هەموو کەسێك تا بتوانن خوێندنی خۆیان درێژە پێ بدەن و هەموویان زەمالەتی خوێندنیان وەرگرتوە و شوقەی بۆ خێزانەکانیش وەرگرتوە، لە کاتێکدا ئەوە دەبێت ئێمە بڕیاری لەسەر بدەین نەك ئەو.

ئەم پاساوەش لە راستیدا لەگەڵ ئەقڵیەتی پارتی دیموکراتدا دێتەوە. ئەوانە هەمیشە جیاکاریان کردوەو دەیکەن لە نێوان خەڵکدا، لێرەوە ئەوان پێیان باش نەبوو هەموو پەنابەرەکان دەرفەتی یەکسانیان دەست بکەوێت، بەلای ئەوانەوە یەکسانی تاوانێکە لێخۆشبوونی نیە.

٣-دەبوو عەبدولمسەوور بکوژرێت چونکە هەمان رێگای باوکی لە یەکێتی سۆڤێت گرتۆتە بەر. ئەم قسەیە بەتایبەت دەدرایە پاڵ مەسعود.

لێرەدا دەبێت رونکردنەوەیەك بدەم، من زانی بووم هەندێك ناکۆکی لە یەکێتی سۆڤێت دروست ببوو، بەڵام تا ئەو کاتەش نەمزانی بوو ئەو ناکۆکیانە چۆن بوون. نەك لەبەر ئەوەی نەمدەپرسی، بەڵکوو لەبەر ئەوەی وەڵامم دەست نەدەکەوت، بەڵام لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەم کە من تا ئەو ساتەوەختەش بە جیددی بە شوێن ئەو پرسەوە نەبووم.

بەڵام دوای ئەو روداوانە مەسەلەکە زیاتر بەلای خۆیدا رایدەکێشام. دوای هەندێك سۆراخکردن، لە لایەن هەندێك کەسی ئازاو چاونەترسەوە هەندێك شتم زانی و دەرکەوت کە ناکۆکیەکان لە روسیا لە سەرەتادا سادە بوون، بەڵام دواجار ئاڵۆسکان. شێخ سلێمان بارزانی لە سەرەتاوە رۆڵی ناوەندگیریی

گێڕاوە، بۆ ئەوەی ناکۆکییەکە پەرە نەسەنێت. بەڵام دواجار شێخ سلێمانیش داویەتە پاڵ ناڕازییەکان و دەرەنجام وای لێ هاتوە مەلا مستەفا کەنارگیر کراوەو تەنها چەند کەسێکی بە دەورەوە ماوە. بێگومان پێشنیارەکەی یەکێتی سۆڤێت ئاگری بن کا بوو، کاتێك یەکێتی سۆڤێت پێشنیاری ئەوەی کردوە کە حکومەتێکی کوردی لە تاراوگە دابمەزرێنرێت و هەمو پارچەکانی کوردستان لە خۆی بگرێت، بەڵام مەلا مستەفا مەسەلەکەی تەسك کردۆتەوە و وای کردووە مەسەلەکە هەر کوردستانی عێراق بگرێتەوە بۆ ئەوەی کوردانی ئێرانی لێ وەدەر نێت. !کاتێکیش خەڵك بەمە دەزانن، لەو حکومەتە دەتەکنەوە و بەوەش رەفتارە تاکلایەنەکانی مەلا مستەفا خەڵکی زیاتر توڕە کردووە. وەك هەندێکیش دەڵێن ژێرزەمینی ماڵی مەلا مستەفا وەك زیندان بەکار هێنراوە بۆ ئەوەی کەسە بەرهەڵستکارەکانی تێدا دەستبەسەر بکات. هەموو ئەو رەفتارانە لە کۆتاییدا روسەکانیان لە هەمووان تووڕە کرد، بۆیە رێگەیان لە جموجوڵی بارزانییەکان تەسك کردەوە. ئەوەی سەیرە رژێمی ستالین کە ملیۆنەها کەسی سەرنگوم کردوەو دوری خستونەتەوە بۆ سیبیریا بۆ ئەوەی لە کامپەکانی ئەوێدا سوخرەکێشی بکەن، بەرامبەر بارزانییەکان دەستی شل کردوەو سزای توندی نەداون. بەڵام دەبێت سوپاسی خوا بکەین لەسەر ئەوە، چونکە ئەگەر وا نەبوایە ئێستا ئەنجامەکانی کارەساتبارتر دەبوون.

بێگومان ئەو سۆراخکردن و بە شوێندا گەڕانە هەندێك راستی تری دەرخست کە تا ئەوکاتە شاراوە بوون و زۆر کەس نەیانوێراوە باسی بکەن، لەوانە ئەوەی ئەبو حەسەن نەفرەشیان بە ناونیشانی "راپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان" باسی کردووە. لەوێدا باسی ئەو هەڵوێستە دوفاقیانە دەکات کە مەلا مستەفا گرتویەتییە بەر بەرامبەر شێخ ئەحمەدی برای، کە شێخی بارزان بوو. بەپێی ئەو یاداشتنامەیە مەلا مستەفا لە رووی براکەیدا گوێڕایەڵی رەهای دەکرد، بەتایبەتی کاتێك پێویستی بە جەنگاوەری بارزانی بوایە و ئەوانیش تەنیا گوێڕایەڵی شێخەکەیان دەبن، بەڵام لەبەرچاوی خەڵکی تردا مەلا مستەفا رەخنەی لە شێخی بارزان دەگرت. پێویستیی مەلا مستەفا بەبراکەی لەو کاتەدا

دەرکەوت کە گەڕایەوە بۆ عیراق و ئەحمەد ئاغای زێباریی کوشت، ئەویش لە ڕێگەی هەندێك بارزانییەوە کە هانی دابوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. بۆ ئەوەی پیلانەکەی خۆی جێبەجێ بکات، گوتبووی شێخی بارزان فەرمانی دەرکردوە بە کوشتنی.

دوای ڕوداوەکە شێخ ئەحمەد بەدوای مەلا مستەفای ناردبوو تاکوو سەبارەت بە ڕوداوەکە ڕوونکردنەوەی بداتێ کە بۆچی بە بارزانییەکانی وتوە ئێوە فەرمانی شێخەکەتان بەجێ دەگەیەنن ئەگەر ناوبراو بکوژن. مەلا مستەفا وەڵامی دابۆوە: گەورەم من هەمیشە بە بارزانییەکان دەڵێم ئەو فەرمانە لە لایەن شێخەوە دەرچوە دەنا کەس بە گوێی من ناکات.

هەمان شت تێبینی دەکرێت کاتێك لە چلەکاندا بە هەماهەنگی لەگەڵ ئینگلیزدا دەگەڕێتەوە بۆ بارزان، هەر کە گەیشتە بارزان وتبوی من بە فەرمانی شێخ هاتوومەتەوە، ئەوەش بۆ ئەوە بوو پشتگیریی بارزانییەکان مسۆگەر بکات.

هەمان شت دوبارە بۆوە کاتێك بارزانییەکان بەیعەتیان بە شێخ خورشید دا وەك شێخی بارزان، ئەوەیش لەسەر ڕاسپاردەی شێخ ئەحمەد بوو. کەم کەس ناڕازی بوون لەو بەیعەتە، ئەوانیش بە فیتی مەلا مستەفا بوون. بەڵام لە نێوان پاسەوانەکانیشیدا بارزانییەك هەبوو کە لە یەکێتیی سۆڤێت لەگەڵ مەلا مستەفا بوو، بە مەلا مستەفای گوتبوو: گەورەم ئێمە لێرە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆ دەکەین بەو سیفەتەی کە برا بچوکی شێخەکەمانیت، بەڵام ئەگەر دەرکەوت سەرپێچی لە فەرمانەکانی شێخی بارزان دەکەیت ئەوە بە گوێت ناکەین، لەبەر ئەوە وا باشە بەیعەت بدەیت ئەگەر نا، ئەوە تفەنگەکەمە و بۆتی دەگێڕمەوە و خۆم دەگەڕێمەوە بۆ بارزان بۆ ماڵەکەی خۆم.

لەبەر ئەوە مەلا مستەفا بە ناچاری داوای کرد نامەیەك بۆ بارزان بنوسن تیایدا بەیعەت دەدات بە شێخ خورشید بارزانی، وەك شێخی بارزان، تەنانەت ئامادەیی خۆی دەربڕی بوو کە بگەڕێتەوە بۆ بارزان بۆ ئەوەی بەیعەتی بداتێ، بەڵام شێخ ئەحمەد گوتبووی: نامەکە بەسە.

هەندێك شت، شتی ترت بیر دێنێتەوە. ساڵی ٢٠٠٥ کاتێك لە زانکۆی سلێمانی دەست بەکار بووم توێژینەوەیەك پێشکەشی زانکۆ کرا سەبارەت بە سۆفیگەری و رۆڵی شێخ ئەحمەد بارزانی لەو چوارچێوەیەدا. کاتێك بە سەرچاوەکاندا گەڕاین ناوی سەرچاوەیەکمان بەرچاو کەوت کەسێك بە ناوی بێلاڵ نوسیبووی، ئەو هەندێك زانیاریی لە ساڵح مەحمود وەرگرتبو، جا نازانین بە خۆشیی خۆی بوە یان بە ناچاری لێی وەرگرتوە، زانیارییەکان سەبارەت بە زنجیرەی شێخانی بارزان بوون، لەوێدا ناوی مەلا مستەفاش وەك شێخێکی بارزان هاتبوو، ئەویش لە رێگەی لابردنی ناوی دوو شێخی پایە بەرز: شێخی شەهید عەبدولسەلام بارزانی و شێخ ئەحمەد، ناوی ئیدریس و مەسعودیشی وەك دوو شێخی بارزان هێنابوو، لە بری ئەوەی ناوی شێخ خورشید بێنێت. بە کوشتنی شێخ خورشید لەسەر دەستی رژێمی سەدام، ئیدی زنجیرەی شێخانی بارزان کۆتایی پێهات، چونکە شێخ خورشید جێگرەوەی خۆی دیاری نەکردبوو، وەك ئەوەی داب و نەریتی بارزانییەکان دەیخوازێت، بێگومان هیچ تەریقەتێکیش نیە لە دونیادا لە یەك کاتدا دوو شێخی هەبێت.

ئەوەی سەیرە ئەم کتێبە لە لاپەڕەیەکدا وەك دوو شێخی بارزان باسی شێخ عەبدولسەلام و شێخ ئەحمەد دەکات، کەچی لە لاپەڕەیەکی تردا بە شێوەیەك باسیان دەکات کە سیفەتی شێخایەتییان لێ دەسەنێتەوە و دەیدا بە مەلا مستەفا و هەردو کوڕەکەی: ئیدریس و مەسعود.

پێدەچێت هەوڵدان بۆ شێواندنی رووداوە مێژووییەکان درێژەی هەبێت بۆ ئەوەی هەندێك هەڵەو تاوان بپۆشن کە لە رابوردویەکی نزیکدا روویانداوە. لەسەرەتای ساڵی خوێندنی ٢٠٠٩– ٢٠١٠ زانیاریمان پێگەیشت کە دوو خوێندکار دەیانەوێت توێژینەوەیەکی دەرچوون بنوسن سەبارەت بە ناکۆکییە حزبییەکان و شەڕە ناوخۆییەکان، بۆیە رامسپاردن کە زۆرترین سەرچاوە لە حزبە پەیوەندیدارەکان کۆ بکەنەوە، وەك کتێب، گۆڤار، بڵاوکراوەکان، بەیاننامەی حزبی، هەواڵی رادیۆ و تەلەفزیۆن،... ئینجا چەندین سەرچاوەی بێلایەنیش پەیدا بکەن سەبارەت بە بابەتەکە. ئینجا دوای ئەوە دەتوانن بکەنە

دەرەنجامی بێلایەن، ئەویش دوای ئەوەی ئەو سەرچاوانە بە شێوەیەکی بێلایەن هەڵئەسنگێنن. ئەو دوو خوێندکارە– کە هەردوکیان کچ بوون– بۆ ئەوەی ڕاسپاردەکەی من بەجێ بگەیەنن، سەردانی بارەگاکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستانیان کردبوو. لەو بارەوە توانیبویان هەندێك سەرچاوە لە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و چەند حزبێکی تر کۆ بکەنەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان بە دوو خوێندکارەکەیان ڕاگەیاندبوو کە هەڵەکەیان لە کیس چووە چونکە حزب ماوەی هەفتەیەکە هەموو ئەو دیکۆمێنتانەی سوتاندووە، هەندێك لایەنی تریش ئەو هەواڵەیان پشتراست کردەوە. کەواتە ئێستا ئێمە لەبەردەم نوسینەوەی مێژوویەکی نوێداین، بەڵام دور لە دیکۆمێنتە مێژووییەکان.

ڕوداوێکی تریش هەیە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بەو ڕوداوەی پێشوەوە هەیە، یەکێك لەوانەی چوبون بۆ یەکێتی سۆڤێت هەندێك ڕوداوی بۆ باسکردم کە لە سەردەمی کۆماری مهاباد ڕوویانداوە، لەوانە ئەوەیە کە مەلا مستەفا دوای ئەوەی پلەی ژەنەراڵ وەردەگرێت و جلی سەربازی دەپۆشێت پێی ڕاگەیاندون: لەمەودوا نە شێخ عەبدولسەلام هەیە نە شێخ ئەحمەد بەڵکو تەنیا من هەم.

کاتێك ئەم ڕوداوانەت بیر دەکەوێتەوە ناتوانیت نەگەڕێیتەوە بۆ ڕوداوە خوێناوییەکانی ساڵی ١٩٢٧، کە شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی تێیدا بوە قوربانی و چەندین چیرۆکی درۆیان بۆ هەڵبەست. بەڵام ئەو ڕوداوانەی لەسەرەوە باسمان کردن ئەوە دەسەلمێنن کە دەبوو ئەو تۆمەتانەی دراونەتە پاڵ شێخ عەبدولڕەحمان بدرێنە پاڵ ئەوانەی ئەو درۆیانەیان هەڵبەستوە.

٤–پڕوپاگەندەیەکی تر کە هەندێك لە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاویان کردبۆوە، ئەوە بوو کە گوایە مەسەلەکە پەیوەندیی بە ململانێ شێخایەتی بارزانەوە هەیە چونکە مەلا مستەفا شێخایەتییەکەی بۆ خۆی قۆرخ کردوەو نەیهێشتوە شێخ سلێمان ببێتە شێخ.

بێگومان ئەم قسەیە تەواو پوچ و بێمانەیە، چونکە هەردوو کەسەکە هەر لە بنەڕەتەوە هیچ پەیوەندییەکیان بە شێخایەتیی بارزانەوە نیە تەنها باسکردنی ئەو قسانە ئەوە دەردەخات کە ئەو کەسانە هیچ زانیارییەکیان لەبارەی داب و نەریت و مێژووی بارزانەوە نیە. لەبەر ئەوە پێویست ناکات لەوە زیاتر درێژە بەو بابەتە بدەین.

٥-دوا پاساوی پوچتریش لەو کاتە بیستم کە گەڕامەوە بۆ کەرەج بۆ لای شێخ محەمەد خالید بارزانی. ئەو جۆرە پاساوانەش تەنیا کاری کەسانی هیچ و پوچن. ئەو گوتی: دوای ئەو روداوەی توشت هات، هەمو رۆژێك دەهاتن بۆ لای من و چیرۆکێکی تازەیان پێ بوو کە جیاواز بوو لەوی پێشتر، بەڵام دواجار بۆ ئەوەی بۆم بسەلمێنن کە هەر دەبوو کارێکی لەو جۆرە بکەن (واتە هەوڵی کوشتنەکەی من) وتیان عەبدولسەمەر جنێوی بە شێخ ئەحمەد داوە. لێرەدا من پێم گوتن راوەستن بەسە و لە ماڵەکەم بچنە دەرەوە، ئەوە مەحاڵە، هەموو قسەکانتان درۆن و باوەڕ بە هیچیان ناکەم.

بێگومان ئەو شێوازە نزم و سوکە یەکەمجار دژی شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی بەکار هاتوە لە بیستەکاندا بەڵام دواجار رەفتارەکانی مەلا مستەفا سەلماندیان کە ئەو قسانە هەمووی درۆ بوون. سەبارەت بە منیش هەمان درۆ بڵاو کرایەوە بۆ ئەوەی پاساو بۆ هەوڵی تیرۆرکردنەکەم بێننەوە.

لەو باوەڕە دام ئەو شێوازی کارانە پیسی و نزمیی ئەو کارانە دەردەخات کە ئەوان پیادەیان کردوە تاکوو ناوو شۆرەتی نەیارەکانیان لەکەدار بکەن، و کەسانی سادە و نەزانیان لێ هان بدەن، بەتایبەتی کە ئەوان هیچ پاساوێکیان نەبوە بۆ ئەو کارە.

بێگومان من خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە کوڕی شێخێکی بارزانی پشتگیریی لێ کردوم و درۆکانی ئەوانی رەت کردۆتەوە. بە راستی ئەو شتانە هەر لە کەسانی ترسنۆك دەوەشێنەوە. ئەو هەڵوێستەی شێخ محەمەد خالید ئەویش هەر وەك هەڵوێستەکەی باوکی بوو، شێخ ئەحمەد بارزانی، کاتێك ئەو تۆمەتانەی بە درۆ خستەوە کە درابونە پاڵ شەهید واتە شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی.

بێگومان ئەم قسەیە تەواو پوچ و بێمانەیە، چونکە هەردوو کەسەکە هەر لە بنەڕەتەوە هیچ پەیوەندییەکیان بە شێخایەتیی بارزانەوە نیە تەنها باسکردنی ئەو قسانە ئەوە دەردەخات کە ئەو کەسانە هیچ زانیارییەکیان لەبارەی داب و نەریت و مێژووی بارزانەوە نیە. لەبەر ئەوە پێویست ناکات لەوە زیاتر درێژە بەو بابەتە بدەین.

٥-دوا پاساوی پوچتریش لەو کاتە بیستم کە گەڕامەوە بۆ کەرەج بۆ لای شێخ محەمەد خالید بارزانی. ئەو جۆرە پاساوانەش تەنیا کاری کەسانی هیچ و پوچن. ئەو گوتی: دوای ئەو رووداوەی توشت هات، هەمو رۆژێك دەهاتن بۆ لای من و چیرۆکێکی تازەیان پێ بوو کە جیاواز بوو لەوی پێشتر، بەڵام دواجار بۆ ئەوەی بۆم بسەلمێنن کە هەر دەبوو کارێکی لەو جۆرە بکەن (واتە هەوڵی کوشتنەکەی من) وتیان عەبدولسەور جنێوی بە شێخ ئەحمەد داوە. لێرەدا من پێم گوتن راوەستن بەسە و لە ماڵەکەم بچنە دەرەوە، ئەوە مەحاڵە، هەموو قسەکانتان درۆن و باوەڕ بە هیچیان ناکەم.

بێگومان ئەو شێوازە نزم و سوکە یەکەمجار دژی شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی بەکار هاتوە لە بیستەکاندا بەڵام دواجار رەفتارەکانی مەلا مستەفا سەلماندیان کە ئەو قسانە هەمووی درۆ بوون. سەبارەت بە منیش هەمان درۆ بڵاو کرایەوە بۆ ئەوەی پاساو بۆ هەوڵی تیرۆرکردنەکەم بێننەوە.

لەو باوەڕە دام ئەو شێوازی کارانە پیسی و نزمیی ئەو کارانە دەردەخات کە ئەوان پیادەیان کردوە تاکوو ناوو شۆرەتی نەیارەکانیان لەکەدار بکەن، و کەسانی سادە و نەزانیان لێ هان بدەن، بەتایبەتی کە ئەوان هیچ پاساوێکیان نەبوە بۆ ئەو کارە.

بێگومان من خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە کوڕی شێخێکی بارزانی پشتگیریی لێ کردوم و درۆکانی ئەوانی رەت کردۆتەوە. بە راستی ئەو شتانە هەر لە کەسانی ترسنۆك دەوەشێنەوە. ئەو هەڵوێستەی شێخ محەمەد خالید ئەویش هەر وەك هەڵوێستەکەی باوکی بوو، شێخ ئەحمەد بارزانی، کاتێك ئەو تۆمەتانەی بە درۆ خستەوە کە درابونە پاڵ شەهید واتە شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی.

من پێم وایە زەمانی بێدەنگ بوون لە ئاست ئەو کارانەدا بەسەر چووە و دەبێت لە بەردەم رای گشتیدا ریسوا بکرێت، بەڵکوو پێم وایە بێدەنگ بوون لە ئاستی ئەو تاوانانە وەك ئەوەیە لە تاوانەکەدا بەشدار بین چونکە بێدەنگ لە ئاستی راستیدا شەیتانێکی لاڵە.

## کێ فەرمانی کوشتنی منی دەرکردبوو؟

ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە سەرەتادا دانیان بەوەدا نابوو کە فەرمانێکی حزبی بووە. بەڵام هەندێکی تریان دەیانگوت فەرمانەکە راستەوخۆ لە مەسعودەوە دەرچوە، بەڵکو بە پشتبەستن بە قسەی کوردێکی سوریا مەسعود دوای ئەوە کەسەکانی جنێو باران کردەوە و پێی وتون: کوڕی سەگینە من پێم گوتن بیکوژن نەك لێی بدەن.

گرفتەکە لەوە دابوو مەسعود بۆ ماوەیەکی درێژ نکوڵی دەکرد لەوەی ئەو دەستی لەم کارەدا بێت، بەڵکو سوێندی زۆر قورسی دەخوارد کە ئەو ئاگادار نیە. بەڵام ئەو هەموو جار دەڵێت: هەر کارێك من دەیکەم، خەڵك دوای سی ساڵ راستیەکەی دەزانن.

دەبێت دان بەوەدا بنێم کەئەم پرسە بۆ ماوەیەکی درێژ تەمومژاوی بوو، بەڵام پاش کۆکردنەوەی بەڵگەکان و لێدوان و دەستخستنی زانیاری لە بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە هێواشی گەیشتمە ئەو راستیەی کە دەستی تاوانبار کردن راستەوخۆ بۆ مەسعود رابکێشم بێ ئەوەی ئەوانەی تریش بێ بەری بکەم.

## بۆچی گەیشتمە ئەو دەرەنجامە

١-ئەوانەی بەم کارە هەڵسا بوون بە هیچ شێوەیەك لێپێچنەوەیان لەگەڵدا نەکرا، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو تاوانە دەرگای سەرکەوتن و پلە بەرزبوونەوەی

بۆ کردنەوە لە ناو حزب و سودمەند بوون لەو گەندەڵیە ئیدارییەی هەیە، ئەوانیش هەموویان سەر بە دەزگای پاراستن بوون، کە مەسعود سەرۆکی بوو.

٢—لە یەکەم سەردانم بۆ ئێران پاش ئەوەی چووم بۆ نەمسا، بە فڕۆکە هاتمە ئیستانبول و لەوێوە بە پاس بەرەو کەرەج بەڕێ کەوتم بۆ ئەوەی زۆرترین بەشی کوردستانی تورکیا ببینم. لە کەرەج جارێکی تر ئەم پرسە لەگەڵ چەند لایەنێکدا وروژێنرا، کە گرنگترینیان ئیدریس بوو. من لە ماڵی مەلا مستەفا بە ئامادەبوونی براکەم عەبدولسەلام بارزانی، ئیدریسم بینی، لەوێدا بە راشکاوی بە ئیدریسم گوت ئێوە رێککەوتنەکەی نێوانمانتان پێشێل کردوە و پەیمانتان شکاندوە، پەیمانێك کە سوێندتان خواردبوو بە ئەمەك دەبن لەسەری، بەڵکو هەر ئێوەش لەپشت هەوڵی تیرۆر کردنی منەوە بوون، ئەو هەوڵەی کە تاوانێکی نزم و نائەخلاقی و ترسنۆکانە بوو، هیچ پاساوێکیشی نەبوو.

من ئەو وشانەم بۆ ئەوە بەکار هێنا تاکوو ئیدریس تووڕە بکەم و سوکایەتی بە هەموو ئەوانە بکەم کە دەستیان لەو کارەدا هەبوە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ.

بەڵام ئیدریس هەمان وشەکانی منی دووبارە کردەوە: ئەوە کارێکی ترسنۆکانەو نزمە. ئینجا گوتی من ئاگاداری ئەو رووداوە نیم.

لێرەدا دەبێت هەڵوەستە بکەین، چونکە بەپێی زانیارییەکانی من ئیدریس خۆشحاڵ بوو بەوەی کە رویداوە چونکە وتبووی: شتێکی باشە ئەگەر لوتی بشکێنرێت!

بەڵام یەکێك لە ئامادەبوان پێی گوتبو: بەڵام ئەوانەی هەڵساون بەو کارە بەئاشکرا جنێو بە ژنەکانتان دەدەن. ئیدریس وەڵامی دابۆوە وتبووی: ئەگەر ئەوە هۆیەکەی بوو بێ، دەبێ عەبدولسەلام رۆژانە لەگەڵ هەزاران کەس بە شەڕ بێت. بەڵام دوای ئەوە ئیدی هەڵوێستی گۆڕی و هیچ پشتیوانییەکی لەو کارەی نەکرد.

لە راستیدا من بە دورم نەدەزانی ئیدریس دەستی لەو کارەدا نەبوبێت، ئەوەش بە هۆی هەلومەرجی کاتی رووداوەکە، چونکە کەسە نزیکەکان دەیانزانی

ئیدریس دوای ئەوەی هاتبوە کەرەج ئیتر کەنارگیر کراوەو ئاگای لە زۆر شت نیە، لە کاتێکدا مەسعود پێگەی بەهێزتر بوو لەو ماوەیەدا.

منیش گوتم: کەواتە دەشێت باوکت و براکەت لە پشت ئەم کارەوە بن.

ئەو گوتی: پێم وانیە ئەوان دەستیان هەبو بێت لە روداوەکەدا.

من گوتم: ئیدریس، زۆر ئاسانە راستیی مەسەلە بزانین. ئەگەر راستە ئێوە بێتاوانن، فەرموون بەیاننامەیەك لەو بارەوە دەر بکەن و خەڵك دڵنیا بکەنەوە لەوەی کە ئێوە لەم تاوانە نەگلاون. ئەم کارە ئیدانە بکەن و ئەو کارەش بە کارێکی ترسنۆکانەو نا ئەخلاقی ناو بەرن.

ئیدریس بێ دودڵی و بێ هەڵوێستە کردن گوتی: ئەوە داوایەکی رەوایەو مافی خۆتە داوای شتێکی وا بکەیت و وەڵامدانەوەشی هەر سەعاتێکی دەوێت و هەمو شتێك کۆتایی دێت. ئێمە ئەوە دەکەین کە تۆ داوای دەکەیت و دەیسەلمێنین کە ئێمە پەیوەندیمان بەم کارەوە نیە.

ئەم هەڵوێستە گەیاندمیە ئەو باوەڕەی کە بەلایەنی کەمەوە ئیدریس تێوە نەگلاوە، بەڵام ئەو بەیاننامەیە تا نوسینی ئەم دێرانەش هەر دەرنەچووە. بەوەش بۆم دەرکەوت کە ئەم کارە دەستی مەلا مستەفا یان مەسعود یان هەردوکیانی لەپشتە.

٤-بەپێی هەڵسەنگاندنی خۆم، ئیدریس توانیویەتی سود لەو هەڵوێستەی وەربگرێت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە مەیدانەکە دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك کەنارگیریی بەسەردا سەپێنرا. ئەو رایەی من سامی عەبدولڕەحمانیش لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێداوە، چونکە ئیدریس گوتی: ئەوەی تۆ لە بارەی هەندەرانەوە دەیڵێیت ئەوە دەسەلمێنێت کە ناتوانن هیچ دەستکەوتێکیان هەبێت، بەڵام من دەتوانم دەستکەوتی زیاترم هەبێت.

وەك دەوترێت: کۆستی کەسانێك بۆ کەسانێکی تر دەبێتە دەستکەوت.

ئەوە دواجار بوو من ئیدریس ببینم. دوای ئەوە بە چەند ساڵێك ئیدریس لە ئێران لە کەشێکی تەمومژاویدا گیانی لەدەستدا.

٥-دوای گەڕانەوەم بۆ نەمسا بۆ خوێندن و بەرگریکردن لە کەرامەت و مافەکانی خۆم، لەکاتی پەیوەندییەکی تەلەفۆنیمدا لەگەڵ مەسعود، ئەو هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: ئەگەر بێدەنگ نەبیت براکەت لە کەرەج دەکوژم.

لە کەرەج تەنها عەبدولسەلامی برامی لێ بوو. ئیتر ئەویش مەترسی کوشتنی لەسەرە، کەواتە چۆن بتوانین ئەم هەڵوێستە لێك بدەینەوە و ڕۆڵی مەسعود چی بوە تێیدا؟

هەروەها ئاستەنگ دروستکردن لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بەردەوام بوو و هەڕەشەی ئەوەیان لێ دەکردم کە ناهێڵن خوێندنەکەم تەواو بکەم. هەر بە ڕاستیش سکاڵایەکیان لە دژم تۆمار کردبوو کە گوایە بڕوانامەکەم ساختەیە بە بەڵگەی ئەوەی تەنیا بڕوانامەکەی من لە لایەن باڵیۆزخانەکان و وەزارەتی دەرەوە پشتڕاست کراوەتەوە.

پیاو ناتوانێت لەگەڵ ئەورووپییەکان بگاتە ئەنجامێکی باش ئەگەر لایەنی بەرامبەر بەڵگەی تەواوی هەبێت. کاتێك قسەم لەگەڵ دکتۆر کۆلەر کرد مەسەلەکە لە قازانجی من یەکلایی بۆوە، تێمگەیاند مەسەلەکە تەواو پێچەوانەیە.

هەروەها زانیارییان دابوو کە گوایە من مانگانە موچە لە مەلا مستەفا وەردەگرم، لەبەر ئەوە دەبێت زەمالەتەکەم ببڕن. من ئەو زانیارییەم دوای ئەوە زانی کە زەمالەتەکەمیان بڕی، کاتێك سەردانی بەشی پەنابەرانی وەزارەتی ناوخۆم کرد، لەوێندەر لانك شفیدەر بابەتەکەی بۆ باسکردم. ئەم واقیعە ناچاری کردم بۆ ماوەیەکی درێژ کار بکەم و بشخوێنم. بەڵام وێڕای هەموو ناڕەحەتییەکان، لای کارمەندانی نەمسا ئەوەیان بڵاوکردبۆوە کە گوایە من بومەتە ئەندامی پارتی نازی، یان بە شەو تەلەفۆنیان بۆ دەکردم بێ ئەوەی قسە بکەن تەنها بۆ هەراسانکردنم، چونکە دەیانزانی دەبێت بەیانی زوو هەڵسم بۆ ئیش و دوای نیوەڕۆش بچم بۆ خوێندن، دەڵێم وێڕای هەموو ئەوانە کەس لە خوێندندا پێشم نەکەوت. بێگومان ئیشکردن و خوێندن پێکەوە کارێکی سەختە، بە تایبەتی لە ئەورووپا بەڵام باوەڕ بەخۆبوون و ئارامگرتن دەتوانن

سەرکەوتنت بەدەست بخەن. من دان بەوەدا دەنێم کە ئەو ماوەیە قورسترین ماوەی ژیانی من بوو بەڵام بەختەوەرم کە توانیم بە سەرکەوتویی بیبڕم. چونکە هیچم بۆ نەمابۆوە ئەوە نەبێت کە ئارام بگرم.

لە راستیدا هەندێك کەس بەلایانەوە سەیر بوو کاتێك دەیانبینی تێزەکەم هەشت سەد لاپەڕەیە و بە زمانی ئەڵمانیشە، بابەتەکەش لەسەر کێشەی کوردە بە ناونیشانی (پاراستنی کوردەکان). ئێستاش لە یادمە هاوڕێیەکم لە بەشی ناوخۆیی گوتی (ئەم کارە کاری کافرانە). مەبەستی ئەوە بوو ئەمە کارێکی گەورە و شازە.

لە راستیدا من دەمویست ئەم تێزەم ببێتە پەیامێك بۆ نزیکخستنەوەی پرسی کورد لە گەلی ئەڵمان. کاردانەوەکانیش لەو بارەوە زۆر باش بوون. ئێمە (٣٥٠) نوسخەمان لەبەری گرتەوەو دابەشمان کرد بەسەر کەسایەتییە سیاسیەکاندا، لەوانە برۆنۆ کرایسکی و ئۆڵف پاڵمە و هاینس فیشەڕ و هتد...

لە سەردانی دووەمم بۆ ئێران هەڕەشەکانی مەسعودم بۆ عەبدولسەلام سەیدای برام گێڕایەوە و پێم گوت مەسعود هەڕەشەی کوشتنی تۆی کردبوو ئەگەر بەردەوام بم لەسەر باسکردنی هەوڵی ئەو بۆ کوشتنم بەڵام عەبدولسەلام ئامادە نەبوو باوەڕ بە قسەکانم بکات. پاش هەندێك تێڕامان گوتی عەبدولمسەور ئەوەی تۆ دەیڵێیت بە ئەقڵدا ناچێت. ئێوە بە تەلەفۆن قسەتان کردوە، دڵنیام تۆ بە هەڵە لە قسەکانی مەسعود تێگەیشتوویت چونکە هێڵی تەلەفۆن هەندێك جار تێکدەچێت و تێکەڵاوی دەکات.

کاتێك هەمان بابەتم بۆ شێخ محەمەد خالید بارزانیش گێڕایەوە، ئەویش هەمان هەڵوێستی عەبدولسەلامی هەبوو، گوتی: باوەڕ ناکەم هەرگیز مەسعود بتوانێت قسەیەکی لەو شێوەیە بکات. هەر دەبێت هەڵەیەك روویدا بێت و تۆ هەڵە تێگەیشتبیت.

بەڵام دوای چەندین ساڵ کاتێك گەڕامەوە بۆ کوردستان، لەو سەردانەمدا عەبدولسەلامی برام پێی گوتم ئەو دو جار هەڕەشەی کوشتنی لێ کراوە. جارێك

له لایەن مەسعودەوەو جارێکی تریش نێچیرڤان پێی وتبوو: دەبێت واز له بەرهەڵستیکردنی ئێمە بێنێت دەنا روداوی سەر جادەکان زۆر روو دەدەن!

مەسعودیش بەم شێوەیە لە رێی شێخ محەمەد خالیدەوە پێی راگەیەنرابوو: دەزانم بزر دەبێت و کەس شوێنی نادۆزێتەوە.

منیش بە هێواشی پێم گوت: برام هەرگیز باوەڕ ناکەم مەسعود بەو شێوەیە هەڕەشە بکات و دور نیە هێڵی تەلەفۆنەکە خراپ بوبێت و پەکی کەوتبێت. ئەو وەڵامی دایەوە: نەخێر بە تەلەفۆن نەبوو بەڵکوو کەسێکی راسپاردبوو کە ئەو هەڕەشەیەم پێ بگەیەنێت.

منیش هەر بە مەبەستی تورەکردنی گوتم: کەواتە تۆ هەڵە تێگەیشتوویت چونکە مەسعود لەوە پاکترە کە هەڕەشەی کوشتن بکات. لێرەدا سەیدای برام دایە پێکەنین.

گوتم: برام بەڵای خراپ ئەوەیە بە پێکەنینت دێنێت. من زوو حەقیقەتی مەسعودم پێ وتون بەڵام ئێوە باوەڕتان پێ نەکردم، پێدەچێت هەندێك کەس دەبێت خۆیان شتەکان تاقی بکەنەوە تا باوەڕ بکەن.

لە سەردانێکی ترم بۆ کوردستان عەبدولسەلامی برام پێی راگەیاندم شێخ محەمەد خالیدیش، کە خەزوری مەسعودە ، لە لایەن مەسعودەوە هەڕەشەی کوشتنی لێ کراوە.

کاتێکیش سەردانی شێخ محەمەد خالیدم کرد لە ماڵەکەی خۆی، ئەویش ئەو هەڕەشانەی بۆ باس کردم کە مەسعود بۆی ناردبوو. ئەو زۆر تورە بوو، دەیگوت: ئەگەر مردم نامەوێت مەسعود لە ناشتنم ئامادە بێت.

منیش لەسەر راسپاردەی عەبدولسەلامی برام بێدەنگیم لێکرد و هیچم لەو بارەوە نەووتەوە.

لە راستیدا ئەم ناکۆکیەی دوایی دوا گەڕی ئەو ناکۆکیە بوو کە مەلا مستەفا لە ساڵی ١٩٢٧ هەڵیگیرساند، کاتێك شێخ عەبدولڕەحمان بارزانیی کوشت، چونکە لەو کاتەوە دەیویست دەست بەسەر هەموو بارزاندا بگرێت، ئەویش بە بەکارهێنانی شێواز و رەفتاری ئاغا و دەرەبەگەکان بۆ ئەوەی بارزانییەکان

ناچار بکات گوێڕایەڵی خۆی بن. بەڵام پیلانەکەی شکستی هێناو هەر ئەوەی بۆ مایەوە کە درۆ و پڕۆپاگەندە دژی شێخ عەبدولڕەحمان بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی پاساو بۆ رەفتارەکانی خۆی بێنێتەوە.

دوای شەهید بوونی شێخ خورشید بارزانی- کە دوا شێخی بارزانییەکان بوو- لەسەر دەستی رژێمی سەدام، ئیدی بارزانییەکان شێخیان نەما، چونکە شێخ خورشید کەسی دوای خۆی دەستنیشان نەکردبوو وەك جێگرەوەی خۆی وەك ئەوەی لە داب و نەریتی بارزانییەکاندا پەیڕەو دەکرێت.

بەڵام وەك ئەمری واقیع شێخ محەمەد خالید بارزانی کە کوڕە گەورەی شێخ ئەحمەد و گەورەی بنەماڵەی بارزانییەکان بوو و رێزێکی زۆریشی لە ناو بارزانییەکان هەبوو، ئاسایی بوو کە رۆڵێکی پێشەنگ لە ناویاندا ببینێت هەرچەند وەك شێخی بارزان بەپێی دابونەریتەکانی خۆیان، نەناسرابوو.

پێدەچێت مەسعود بە هەلی زانی بێت دەست بەسەر ناوچەی بارزاندا بگرێت، بۆیە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بارزانییەکان رەعیەتی ئەون.

لەسەردانێکم بۆ هەولێر هەستم بە هەبوونی گرژی کرد لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردولادا، کاتێك لە ریستۆرانی ئاڵتوونی لە هەولێر لەگەڵ کۆمەڵێك لە بارزانییەکان چاوپێکەوتنم کرد. ئەوان داوایان لێکردم لەگەڵیان بڕۆمەوە بۆ ماڵیان بۆ ئەوەی باسی هەندێك شت بکەن و گفتوگۆی لەسەر بکەین. لە ماڵەوە پێیان گوتم ئەوان هەڕەشەیان لێکراوە لە لایەن مەسعودەوە بۆ ئەوەی سەردانی شێخ محەمەد خالید نەکەن. کەواتە مەسعودیش هەمان پیلانی باوکی بەکار هێنا بوو. پیلانەکە وا دەخوازێت قوربانییەکە کەنارگیر بکەن و بە تەواوەتی لە دەوروبەرەکەی دابڕن، تا لە کۆتاییدا ناچاری بکەن چۆك دابدات یان ناوچەکە جێ بێڵێت.

ئامادەبوان قسەی زۆریان کرد و منیش تەنیا گوێم گرتبوو، یەکێکیان ئاوڕی لێدامەوە گوتی: دەمانەوێت رای تۆش بزانین، منیش گوتم: پێم وایە مەسەلەکە روون و ئاشکرایە، ئەمە یەکەمجار نیە ئەو شێوازە بەکار دێنن، بەڵکو

دووبارەکردنەوەی کارەکانی رابوردوویانە، عوبەیدوڵڵا و عوسمان و لوقمان و فلان و فیسارتان لەبیرە ئایا هەمان سیاسەت لە دژیان پەیڕەو نەکراوە؟

من دەپرسم: ئەگەر ئەم جارە ئەم پیلانە دژی شێخ محەمەد خالید سەر بکەوێ، ئەی دوای ئەوە کێی تر دەبێتە قوربانی؟

یەکێکیان پێکەنی و گوتی: کەس نەماوە تۆ نەبێت بێگومان کاتی تۆش دێت.

من بەردەوام بووم لە قسەکانم گوتم: بەراستی من هیچ پێویستم بە شێخ محەمەد خالید نیە، بەڵام نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت کە ئەو کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانییە، لەبەر ئەوە گوێ بەو هەڕەشانە نادەم، هەروەك لەگەڵ شێخ عوسماندا گوێم پێنەدا کاتێك هەمان هەڵوێستیان لێ گرت، تەنیاش لەبەر ئەوەی هەردوکیان کوڕی شێخ ئەحمەدن. بۆیە لە رێی گەڕانەوەم سەردانی شێخ محەمەد خالید دەکەم تاکوو راستیی قسەکانم بسەلمێنم. هەر بە راستیش رۆژی دواتر سەردانی شێخ خالیدم کرد. من لە بارێکدا نەبووم کە بتوانم هاوکاریی بکەم، بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەتوانم بەشداری نەکەم لە ئازاردان و کەنارگیرکردنی. هەروەها داوام لە شێخ محەمەد خالید کرد کە بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەم بابەتە لە ناوچەکە هەڵبژاردنێك بکەن، بەڵام شێخ محەمەد خالید ئەو پێشنیارەی رەتکردەوە و گوتی: لەو کاتەدا ئەوان بە بەرتیل و هەڕەشەی کوشتن ئامانجی خۆیان دەپێکن، هەر کەسێك دژیان بێ، پێی دەڵێن: ئەگەر لە دەرگای ماڵەکەت بێیتە دەرەوە دەتکوژین.

ئەوەی سەیرە ئەوانەی ساڵی ٢٠٠٩ داوای هەڵبژاردنیان دەکرد رێگەیان لە هەڵبژاردنەکە گرت. بەڵکو بە هەڕەشەی کوشتن و دەرکردن لە کار و لە ناوچەکەش خەڵکەکانیان ناچار کرد کە دەبێت دەنگ بدەن بە لیستەکەی ئەوان، هەر رێك وەك ئەوەی شێخ محەمەد خالید پێشبینی کردبوو.

بۆیە بە پێی هەڵسەنگاندنی خۆم بۆ ئەو پێشرەفتانەی کە لە بارزان روویاندەدا، یەکلاکردنەوەی ململانێکان لە نێوان شێخ محەمەد خالید بارزانی و مەسعود و سەرکەوتنی مەسعود لەو ململانێیە، دوا زنجیرەی ئەو کۆدەتایانە

بوو کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٧ دەستیان پێکردو هێڵی راستی بارزانییەکانیان بەلاڕێدا برد. ئەم کارەش بە کوشتنی شێخ عەبدولڕەحمان بارزانی دەستی پێکرد کە ئەو یەکەم قوربانیی ئەم پیلانە بوو. ئەم پیلانە لە کوشتنی شێخ عەبدولڕەحمان و چەند بارزانییەکی تر گەورەتر بوو، لەم کتێبەشدا هێند بەڵگەمان لە بارەوە هێناوەتەوە کە پێمان وایە بەس بێت بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم تیۆرییانەی ئێمە.

٤-ساڵی١٩٧٩ مەسعود سەردانی ڤیەننای کرد لە کاتێکدا شەڕی ناوخۆی کوردستان بەردەوام بوو. هەرچەند ناوبەناو دەوەستا، بەڵام لەم شەڕانەدا هەزاران لاوی کورد بوونە قوربانی و هەزارانی تریش دەربەدەر بوون وەك ئەوەی ئێمە لە ساڵی ١٩٧٦ پێشبینیمان کردبوو. هەردولامان لەم مەترسیانە ئاگادار کردبۆوە. ئەو رقە قوڵەی هەردولا بەرامبەر یەکتر هەیانبوو، زۆر بە ناشیرینی رووی دزێوی خۆی دەردەخست و نمونەشمان لەم بارەیەوە زۆرە، وەك کوشتنی عەلی عەسکەری هەرچەندە بە دیل گیرابوو. دەڵێن سامی عەبدولڕەحمان بە ئار بی جی، کوشتویەتی وتویەتی (پیاوی گەورە دەبێت بە چەکی گەورە بکوژرێت)!

یەکەم سەرنجی مەسعود ئەوە بوو کە شوقەکەی من کۆنە، ئەمە لە کاتێکدا خەڵکی تر لە شوقەی خۆشدا دەژین. من وەڵامی سەرنجەکەیم نەدایەوە، چونکە پێم وابوو مەسعود بەسەرهاتی ئەم شوقانە نازانێت و مەسەلەکەش زۆر گرنگ نیە، دوای ئەوە ویستم ئەوە بیری مەسعود بێنمەوە کە ئێمە لە کەرەج لەسەر چی رێککەوتبووین و چۆن ئەوانەی کە مەسعود بە متمانە پێکراوی خۆی دەزانی، ئێستا ئەوان بە ناشیرینترین شێوە سوکایەتی بە بنەماڵەی مەلا مستەفا دەکەن، چۆن مەسعود لە خاڵەکانی رێککەوتنەکە لایداوەو و چۆن دەتوانێت ئەو سوکایەتیانە قەبوڵ بکات؟

مەسعود گوتی دەبێت داوای لێبوردن لەوان بکەین و منیش ئامادەم لەگەڵتدا بێم و دەست بخەنە دەستی یەکترەوە بۆ ئەوەی کێشەکان کۆتاییان پێ بێت. بابەتی سوکایەتی پێکردن، ئەوەیان راست نیە و ئەوانە کەسانی دڵسۆزن و ئەو

قسانەش پڕوپاگەندەیە، ئەوەش چارەسەرەو دەبێت تۆش بە قسەم بکەیت، بەڵام من رەتم کردەوە بەو شێوەیە ناکۆکییەکان یەکلایی بکەمەوە و داوام لێ کرد کە پێویستە چاوەکانی بکاتەوەو واقیع وەك خۆی ببینێت. ئەگەر دانیش بەو راستیەدا نەنێت کە ئەوانە سوکایەتی بە بنەماڵەی مەلا مستەفا دەکەن، ئەوە ئامادەم هەر ئێستا زیاتر لە ١٥ شایەت بێنم بۆ سەلماندنی قسەکانم. لێرەدا مەسعود ناچار بوو دان بەراستییەکەدا بنێت و گوتی منیش وەك ئیدریسی برام ئاگاداری ئەو جنێوانەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر داوای کرد کە پێکەوە بچین بۆ ماڵی ئەو کەسانەی دەستدرێژییان کردۆتە سەرم تاکوو کێشەکە یەکلایی بکەینەوە!

مەسعود جار جارە سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد وەك ئەوەی بڵێ مەوعیدێکی ترم هەیە. ئێمە نەگەیشتینە هیچ رێککەوتنێك بەڵام پێش ئەوەی ماڵەکەم بەجێ بێڵێت ئاگادارم کردەوە لەوەی کە ئەنجامی ئەو کارانە باش نابێت ئەگەر هەر بەو شێوازە کار بکات و نابێت هیچ بە نیازی ئەوە بێت من هاوکاریی بکەم. پێشم گوت بە دوری نازانم هەمان ئەو شتەت بەسەردا بێت کە من بەسەرمدا هاتوە، تا ئەو کاتەی تۆ ئەو کەسانە بە دڵسۆزی خۆت بزانیت.

رۆژی دوایی لە رێگەی رۆژنامەکانی نەمساوە زانیم هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە، کاتێك لەگەڵ فارس باوە چاوپێکەوتنێکی هەبوو لە شەوێکی درەنگداو لە شوێنێکی چۆڵدا. لەو هەوڵەشدا ئازاد بەرواری بریندار بوو چونکە شێوەی لە شێوەی مەسعود دەچوو، بۆیە تێکەڵییەك دروستبوو لای ئەوانەی ویستویانە مەسعود بکوژن، بەڵام (شاگردەکەی مۆساد) چۆن هەڵەیەکی لەو شێوەیەی کردوە؟!

رۆژی دواتر سەردانی نەخۆشخانەم کرد و لەوێ جارێکی تر مەسعودم بینی و پێم گوت: چیم پێ گوتیت، ئاگادارم نەکردیتەوە؟

مەسعود وەڵامی دامەوە: راستیت پێ بڵێم؟ هەرچیەکت وت راست دەرچوو.

من گوتم: مەسعود کاتی ئەوە هاتوە بە خۆداچونەوەیەك بکەیت لە هەڵوێستەکانتدا. ئەگەر من راست دەکەم ئەی بۆ بەو شێوەیە ناجوڵێیتەوە،

بەڵکو ئاراستەی پێچەوانە وەردەگریت؟ مەسعود بێدەنگ بوو و وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە. ئەوەش دوا دیدارمان بوو.

پاش چەند ڕۆژێك هەژار حەسەن حاجو بە تەلەفۆن پەیوەندیی پێوە کردم و داوای چاوپێکەوتنی پەلەی کرد، منیش گوتم ئێستا سەرم زۆر قاڵە و داوام لێ کرد چیی دەوێ پێم بڵێت. بەڵام ئەو ڕازی نەبوو گوتی: ئەم شتانە لە تەلەفۆندا ناوترێن. کەواتە دەبێت هەر یەکتر ببینین. من لە بینینەکەدا بە هەژارم گوت ئەو شتە چیە کە لە تەلەفۆندا ناوترێت؟ ئەو لەو شوێنەدا دانیشتبوو کە چەند ڕۆژێك لەوەو پێش مەسعود لێی دانیشتبوو. گوتی: مەسعود لەگەڵ کۆمەڵێك لە قیادە مۆقەتە سەردانی کردین لە ماڵەوە. داوای لێ کردین بەشداری بکەین لە کاری سیاسیدا، بەڵام من ڕەتم کردەوە و گوتم: ئێمە لێرە زۆر سەرقاڵین و من و ژنەکەم ئیشمان زۆرە و بەیەکەوە کاروباری خێزانەکەمان بەڕێوە دەبەین. دوو منداڵمان هەیەو دەمانەوێت لە نەمسا شتێك بۆ خۆمان پێکەوە بنێین بەڵام مەسعود ئەم بیانوانەی ڕەتکردەوەو ئاماژەی بەوە دا کە ئەگەر تۆ هاوکاریمان نەکەیت ئێمەش ناتوانین هاوکاریت بکەین. هەرچەند من ئاماژەم بە سەختیی ژیانی ئەوروپا دا بەڵام مەسعود سوور بوو لەسەر ئەوەی هۆی ڕاستەقینەی مەسەلەکە بزانێت. ئیدی نەمتوانی لەوە زیاتر شتەکان بشارمەوە بە ڕاشکاوی و بێ ئەوەی یەك وشەی لێ بگۆڕم ڕاستییەکانم بۆ باسکرد. گوتم: ئەو کەسەی لە تەنیشتتەوە دانیشتوە، قسەی ناشیرین بەخێزانت دەڵێت، ئێمە نامانەوێت ئەو جنێوانە دوبارە بکەینەوە کە ئەو وتویەتی، ئیتر چۆن دەتوانم لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە کار بکەم، تۆ دەڵێی چی مەسعود؟

بەڵام مەسعود بەبێ ڕاوەستان وەڵامی دامەوە گوتی: ئەوە هیچ نیە. من خۆم پێم گوتوە وا بڵێت!

هەژار گوتی: عەبدولمەسەور من لەم دنیایە تێناگەم و نازانم لەم بارەدا چ بڵێم و چ بکەم. تۆ ئەڵێی چی؟

پاش تێڕامانێکی کورت گوتم: هەژار با لێرە بە دواوە خۆمان نەخەڵەتێنین. دەبێت دان بەوەدا بنێین کە ئەمەیە پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەوەش

سەرکردایەتییەکەیەتی، مەسعودیش یەکێکە لەو سێ کەسەی لە لوتکەی ئەم سەرکردایەتیە دان، ئەمەیە شێوازی کارکردنیان و وا دەزانن سیاسەت بەو شێوەیە دەکرێت. ئێمە لێرەدا گەیشتوینەتە دورپیانێك و رەهەندەکانی دیارن. دەبێت ئیدی بڕیاری خۆمان بدەین و چاوەڕوانی سودی نیە. من بڕیاری خۆم داوە، وا باشە کەسان و هاوڕێکانیشمان بەم بڕیارەم بزانن تاکوو ئەوانیش بە ئازادی بڕیاری خۆیان بدەن.

لێرەدا دەبێت ئامارە بە هەندێك راستی بدەم:

١-هەژار ئەندازیاری میکانیکیە بەڵام لە دیپلۆماسیەتدا لاوازەو زۆر راشکاوانە قسان دەکات، ئەو سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراوە لە سوریاو تورکیا. بنەماڵەکەی ئەوان پەیوەندییەکی دێرینیان لەگەڵ بنەماڵەی بارزانییەکاندا هەیە و ئاگاداری دابو نەریتی بارزانییان بون لەبەر ئەوە زۆر بە باشی دەیزانی چی باشە و چی خراپە.

ساڵی ٢٠٠٧ سەردانی ڤیەننام کرد و لەوێندەر زۆر لە هاوڕێکانم بەسەرکردەوە. هەژاریشم بەسەر کردەوە و باسی روداوەکانی رابوردومان کرد. دەرکەوت زۆربەی ئەو خێزانانەی مەسعود سەردانی کردون ئەوەیان بە مەسعود گوتوە کە بنەماڵەکەی بەر جنێو و تانە و تەشەری ئەو کەسانە کەوتوە کە ئەم بە دڵسۆزی خۆیان دەزانێت.

هەژار ئامارەی بەوە دا کە بەهۆی ئەو روداوانەوە چەند جارێك بانگێشت کراوە. وەك دەردەکەوێت هەندێك کەس ویستویانە قسەکانی بگۆڕێت بۆ ئەوەی ئەو فەزیحەتە لەبەر چاوی خەڵك بشارنەوە، تەنیا مەسعود نەبێت. بەڵام هەژار بەردەوام جەختی لەوە دەکردەوە کە ئەو تەنیا حەقیقەتی وتوە، ئینجا گوتی: وا دیارە ئێوە حەز دەکەن لەگەڵ ئەو جۆرە خەڵکانە کار بکەن، لەبەر ئەوە تکاتان لێ دەکەم واز لە من بێنن. ئێوە ئازادن چیدەکەن. من نامەوێت خۆم لە نێوانتان هەڵقورتێنم.

٢-وەك دەردەکەوێت مەسعود ناچار بوە لە زۆربەی ماڵەکان بەرەو رووی راستییەکان بێتەوە. هەمویشیان ئەو سوکایەتی و تەشەردانەیان بۆ دوپات

کردۆتەوە کە لە لایەن هەوادارانی خۆیەوە بەرامبەر بنەماڵەکەی کراوە، هەمووشیان سەیریان لە بێدەنگیی مەسعود دەهات لە ئاستی ئەو سوکایەتیانەدا. لێرەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو بڕیاری داوە بەرەو پێشەوە رابکات، وەك ئەڵمانییەکان دەڵێن. جا لەبەر ئەوەی بێدەنگی لە ئاست ئەو رەوشە ئابڕووبەرەدا کەڵکی نەبوو، بۆیە ویستی وا وێنای بکات کە خۆی پیلانی بۆ ئەو کارانە دارشتوە و ئەوان تەنیا فەرمانی ئەم بەجێ دێنن، بەڵام ئەو شتە جێگەی باوەڕپێکردن نیە، چونکە لە سەرەتادا خۆی نکوڵی دەکرد لەوەی شتی وا رووی دابێت بەڵام بە هەر حاڵ ئەنجامی ئەم کارە لە لایەنی ئەخلاقییەوە هەر یەك شتە.

٣-سەبارەت بە خۆم ئەم رووداوە خاڵی لێکدابڕانی تەواوەتیم بوو لەگەڵ مەلا مستەفا و هەردو کوڕەکەی، ئیدریس و مەسعود. نکوڵیش لەوە ناکەم کە لەو رۆژەوە نەفرەت لەو رۆژە دەکەم مەسعودم تێدا ناسیوە. دوای ئەوە ئیتر بە هیچ شێوەیەك حەزم نەدەکرد بیانبینم. ئیدی لێرەوە دابڕانی کۆتایی و تەواو بوو لەگەڵیان. لەوێوە ئیتر هەوڵمدەدا ژیانی خۆم رێك بخەمەوە و خۆم کۆنترۆڵی ژیانی خۆم بکەم دور لە تەفرەدانی ئەوان و درۆکانیان و پیلانە بەردەوامەکانیان دژ بەیەکتر و دژ بەخەڵکانی تریش. لەو کاتەشەوە تا ئەمڕۆ توانیومە دەستکەوت و کاری باش بکەم. ئێستاش سەرم لەوە سوڕ ماوە کە چۆن تێوە گلام و لەگەڵ ئەواندا خەریکی کارێك بووم کە پێی دەوترێت سیاسەت و بڕیارمدا کە نابێت جارێکی تر شتی وا دوبارە بێتەوە.

لەم شوێنەدا پێویست دەکات ئاماژە بە جیاوازییەك لە نێوان هەڵوێستی مەسعود و ئیدریس لە ئاست ئەو سوکایەتی پێکردنانە بکەم. یەکەمیان ئامادە نەبوو دەست تێکەڵ بکات لەگەڵ کەسانێکدا کە بەردەوام سوکایەتییان بە بنەماڵەکەی دەکرد. هەروەها ئیدریس زۆر زوو گەمەکانی سامی عەبدولڕەحمانی زانی بوو و دەستی کەشف کرد بوو. زانی بووی سامی لە رێی کێبڕکێی نێوان مەسعود و ئیدریسەوە خوازیارە دەستی بە پارەی مەلا مستەفا بگات. هەروەها

دەیویست سودمەند بێ لە ناکۆکیی نێوان مام جەلال و مەلا مستەفا. بۆیە سامی بەردەوام هەوڵی دەدا ئاگری شەڕی ناوخۆ خۆش بکات و سود لە سادەیی یارمەتییەکانی مەسعود وەرگرێ. بەڵام هەر کە خۆی لە بنەماڵەی مەلا مستەفا جیاکردەوە، کەوتە خۆ نزیک کردنەوە لە جەلال تاڵەبانی و هەیشە شانازیی بەوەوە دەکرد کە ئەم کارە رەنگدانەوەی زیرەکی و لێزانییە.

## راگرتنی کاری سیاسی به شێوەیەکی کاتی

ئەو کێشانەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان دەیخولقاند بۆ زۆربەی لایەنەکان و بەتایبەتیش بۆ من و لە سەروو هەموشیانەوە هەوڵی تیرۆر کردنەکەم و برینی زەماڵەی خوێندنەکەم لە ڕێگەی راپۆرتی درۆیینەوە کە بەرزیان کردەوە بۆ دەسەلاتدارانی نەمسا و گومان خستنە سەر بڕوانامەکەم و چەندین تەنگ پێهەڵچنینی تر و ناشیرین کردنی ناوو شۆرەتی کورد بەهۆی شەڕی ناوخۆوە کە رۆژنامەو گۆڤارەکان هەواڵەکانیان بڵاو دەکردەوە، هەموو ئەمانە منیان خستبوە نێو تەنگژەیەکی ماددی و ئابورییەوە کە لە رابوردودا شتی وام بەخۆوە نەدیتبوو، بەتایبەتی چونکە من سور بووم لەسەر ئەوەی درێژە بە خوێندنەکەم بدەم و دەبوو لەو پێناوەشدا پارەی پێویست دابین بکەم. دیارە ئارامگری و نەبەزین هەموو سەختیەك سوك دەکەن و هەر ئەوەش لەگەڵ مندا روویدا.

ئەو هەلومەرجەی ملهوڕەکان دەیانەوێت بەسەر ئەوانەدا بیسەپێنن کە پاشکۆی ئەوان نین، لە ڕێگەی هەزار خستنیان و چەندین پیلانی تر، هەموو ئەو شتانە ناچاریان کردم کاروباری سیاسیم بەرتەسك بکەمەوە، هەرچەند بەتەواوەتیش لێی دور نەکەوتمەوە.

پاش تەواوکردنی خوێندنەکەم، بارێکی گران لەسەر شانم لاچوو، کاتی زیاتریشم بۆ رەخسا بۆ ئەوەی هەندێکی تەرخان بکەم بۆ کاروباری سیاسی. لەو کاتەدا کۆمەڵەی پشتگیریکردن لە گەلی کورد و کوردستانمان پێکهێنا، بەلام کاربەدەستانی نەمسا سور بوون لەسەر ئەوەی وشەی (کوردستان) هەڵبگرین تاکوو رەزامەندی بنوێنن لەسەر مۆڵەتپێدان، هەرچەند هەوڵماندا بیانخەینە سەر ئەو بڕوایەی کە کوردستان ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراوە لە ئێران و هەروەها هێڵێکی ئاسمانیی ئێرانیش بە هەمان ناوەوە هەیە. چالاکیی

سەرەکیی ئەم رێکخراوە ئەوە بوو کە نامیلکەی بچوك بنوسێت بۆ ئەوەی خەڵك هۆشیار بکاتەوە سەبارەت بە کێشەی کوردستان، سەرنجی هاووڵاتییانی کورد بۆ ئەو شتانە رابکێشێت کە پێویستە بیزانن و هەروەها دەمانویست رای گشتیی جیهان ئاگادار بکەینەوە لە پرسی کورد بە شێوەیەکی گشتی. دواجار چەند نامیلکەیەکمان دەرکرد سەبارەت بە کۆنگرەی ئیسلامی و چەکی کیمیاویی و عەبدوڵلا ئوچالان و دیموکراسیەت وەك بنەمایەك بۆ چارەسەر. ئەم نامیلکانەمان بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان دەنارد، لەوانە ناردنی نامیلکەی تایبەت بە چەکی کیمیایی بۆ کۆنگرێسی ئەمریکا، لەگەڵ نامەیەکدا. ئەو نامەیەش لە لایەن سیناتۆر تید کیندییەوە وەك بەرپرسی لیژنەی مافەکانی مرۆڤ وەڵام درایەوە. لە راستیدا شەڕی ناوخۆ هێزە کوردییەکانی بەگشتی شەکەت کردبوو و هێز و پرزەی لێ بڕی بوون و ناوو ناوبانگیانی تێکشکاندبوو، بەڵام ئەوەی سەیرە ئێستاش هەندێك سەرکردەی ئەو حزبانە شانازی بەوەوە دەکەن کە دەستیان لە هەڵگیرساندنی ئەو شەڕەدا هەبوە، ئەمە لەبری ئەوەی لێی تەریق ببنەوە.

خۆ ئەگەر ئەو هەڵە کوشندەیەی سەددام نەبوایە کە شەڕی لەگەڵ ئێراندا کردو پاشانیش پەلاماری کوێتی دا و بەو هۆیەوە دەستێوەردانی عەسکەری لە لایەن دەیان وڵاتەوە لە چوارچێوەی هاوپەیمانییەکدا بۆ ئازادکردنی کوێت روویدا و دواتریش ناوچەی دژە فڕین دروست کراو رای گشتیی جیهان هاوسۆزیی لەگەڵ ئاوارە کوردەکان پیشانداو بەزەیی پێیاندا هاتەوە کە ئاوارەی ئێران و تورکیا ببون و زستان تەنگی پێ هەڵچنی بوون، ئەگەر ئەم هەموو روداوە نەبوایە، هیچ لە رەوشی کورد نەدەگۆڕا. تەنانەت ئەو دەرفەتە زێرینەش لە لایەن حزبە کوردییەکانەوە بە هۆی کورتبینی و خۆپەرستییانەوە نەقۆزرایەوەو بەفیڕۆ درا.

وێڕای ئەوەی حکومەتێکی کوردی لە ناوچە پارێزراوەکان پێك هێنرا و لە لایەن چەندین وڵاتەوە پشتگیریی لێ دەکرا، دیسان شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسایەوە و هەزاران کەسی تێدا کوژرا. پاش دروستبوونی ناوچەی دژە فڕین، چەند

جارێك هەلم بۆ هەڵکەوت و گەڕامەوە بۆ کوردستانی عێراق. جاری دوەم کە گەڕامەوە هەستم کرد ناوچەکە لەسەر لێواری شەڕێکی ناوخۆییدایە و حزبەکان خۆیان تەیار دەکەن بۆ شەڕ. کاتێك شێخ محەمەد خالید بارزانی پرسیاری لێ کردم سەبارەت بە بۆچوونم لە بارەی ڕەوشەکەوە، گوتم: شەڕێکی ناوخۆ بەر دەرکی پێ گرتووین و لە ئایندەیەکی نزیکدا هەڵدەگیرسێت.

بەڵام شێخ خالید وەڵامی دامەوە گوتی: تۆ نازانیت چی دەڵێیت. حزبەکان ڕێککەوتون، حکومەتێکی هەمەلایەنە پێك هێنراوە و پۆست و پلەکانیش دابەش کراون و پارەش دابەش کراوە، کەواتە شەڕ کۆتایی هاتوە. من گوتم لە ئایندەیەکی نزیکدا شەڕ دەقەومێ.

پاش گەڕانەوەم بۆ ڤیەننا بە ماوەیەکی کەم شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسایەوە. بەڵام بۆچی من بەو شێوەیە شتەکانم هەڵسەنگاندبوو؟

هۆیەکەی ئەوە بوو کە هەموو بەڵگەکان ئاماژە بوون بۆ ئەوەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان تێری نەدەخوارد لە پارە و دەیویست بە تەنیا دەست بەسەر ناوچەی بادیناندا بگرێت، ئەویش بە هۆی گومرگی ئیبراهیم خەلیلەوە کە پارەیەکی زۆری دەڕژاندە ناو خەزێنەکەیانەوە لەو کاتەدا. سەرکردایەتیی ئەم حزبە هەر لە سەرەتاوە ئەم سیاسەتەی گرتۆتە بەر، هەوڵی داوە هەر چی سەرچاوەکانی داراییە کۆنترۆل بکات و لەو ڕێگەیەوە لایەنەکانی تر ناچار بکات هەر ڕێکەوتنێك ئەو بیەوێت ئەمان مۆری بکەن و لە واقیعیشدا ببنە کلکی ئەو حزبە، جا سەرچاوەی دارایی حکومەتی ئێران بێت یان عێراق یان گومرکی زاخۆ بێت، هیچ جیاوازیی نیە.

کاتێك ئەو حزبە دەست بەسەر سەرچاوەکانی داراییدا دەگرێت، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی حزبەکانی تر بەرەو توانەوە دەچن، بێگومان پێشبینیش دەکرێت هەندێك حزب بە ئاسانی مل نەدەن بۆ ئەو سیناریۆیە، بەڵکوو بەرەنگاری دەکەن، وەك یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، ئەو حزبەی شارەزاییەکی فراوانی لە شێوازەکانی کاری پارتی دیموکراتی کوردستاندا هەیە. لێرەوە دەزانین بۆ سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆ، تەنیا کارێك و کاردانەوەیەك

بەسە، کات و شوێن گرنگ نیە. ئەوانە شتێکی لاوەکین چونکە ئامادەبونێك هەیە. ناکۆکی لەسەر پارچەیەك زەویی بچوك شیمانەی ئەوەی هەیە ببێتە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ. هەر ئەوەش روویدا.

ئەو خۆ نواندن و شانۆگەریانەش هیچ دەوریان نەبوو کە لەبەرچاوی خەڵکە سادەکە دەیاننواند و باسی برایەتییان دەکرد، وەك ئەوەی لە بارزان رویدا، کاتێك مام جەلال گوتی: من و مەسعود هەردوکمان کوڕی مەلا مستەفاین! ئەمە لە رووکەشدا وابوو، بەڵام لە ناوەوە ناکۆکییەکان بەردەوام لە پەرەسەندندا بوون. لەو کاتەدا پارتی دیموکراتی کوردستان بەردەوام تەنگی بە هەرکییەکان هەڵدەچنی بۆ ئەوەی دەست لە مافەکانی خۆیان هەڵبگرن بۆ زێبارییەکان، لە کاتێکدا هەرکییەکان هەواداری جەلال تاڵەبانی بوون و زێباریەکانیش تا رادەیەك هەواداری بارزانی بوون بەڵام هەندێکیان تائێستاش هەواداری ئەرشەد زێبارین.

بۆیە کاتێك مام جەلالم بینی زۆر ناڕەحەت بوو لەو رەفتارانەی پارتی و پێی گوتم: عەبدولموسەور تا کەی دەتوانین بەرگەی ئەو هەراسانکردنانە بگرین؟

رەنگدانەوەی شەڕی ناوخۆ زۆر نێگەتیڤ بوو لەسەر رای گشتی لە دەرەوە. ئێمە پێشبینیی ئەوەمان کردبوو و ئاماژەشمان پێ دابوو، بەڵام هەندێك لایەن، بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان گوێیان بەو ئاگاداریانەی ئێمە نەدەدا و بە هیچیان دەزانی.

بە دوری نازانم من یەکەم کەس بم داوای ئەوەم کردبێت کێشەی کورد بە کێشەی فەلەستین بەراورد بکرێت، ئەویش بۆ ئەوەی بتوانین کێشەی کورد نزیك بخەینەوە لە ئەقڵیەتی عەرەب و هەروەها کێشەی کورد لە تورکیا بەراورد بکەین لەگەڵ کێشەی تورکەکانی قوبرس بۆ ئەوەی تورکەکان لەو ئازار و مەینەتیانە تێ بگەن کە کورد بەدەستییەوە دەناڵێنن و لەوێوە داواکاریە رەواکانیان بسەلمێنن. هەروەها ئەو پێشنیارەی کە پارتی سەوز لە پەرلەمانی نەمسا پێشکەشی کرد بۆ ئەوەی کێشەی کورد وەك کێشەی فەلەستینییەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بە دوری نازانم لە تێزی دکتۆراکەی منەوە وەریانگرتبێت کە خۆم چەند نوسخەیەکم ناردبوو بۆ پەرلەمانی نەمساو حزبەکانی ناو پەرلەمان.

بەڵام پێشنیارەکە لە لایەن پارتی ئازادیخوازانی ئۆپۆزیسیۆنەوە بەر رەخنەیەکی زۆر درا، چونکە دەیانگوت مەسعود و جەلال لە پێناوی بەدەستهێنانی پارەدا هەمو شتێك دەکەن.

لە ڤیەننا مام جەلالم ناسی، لە کاتێکدا بە سەردانێك هاتبوە نەمسا، لەوێ سوپاسم کرد لەسەر ئەوەی هەڵوێستێکی دروستی نواندبوو لە ئاست ئەو بارزانییانەی کە حکومەتی سەدام سەرنگومی کردبوون، جا بە راستەوخۆ بێت یان لە رێگەی هاورێکانیەوە بێت. لە راستیدا نەرمی نواندنی من بەرامبەر مام جەلال و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان دەگەرێتەوە بۆ ئەو نەرمی نواندنەکەی عوبەیدوڵڵای بارزانی دەینواند بەرامبەریان. عوبەیدوڵڵا لە بارەی ناکۆکییەکانی نێوان باوکی و مام جەلال دەیگوت: هەندێك شت زۆر زێدەرۆیی تێدا دەکرێ، لە کاتێکدا دەبوایە ئەو شتانە بچوك بکرێنەوە. هەروەها مەلا حەسەنی بایەزدین بە راشکاوی داکۆکیی لە مام جەلال دەکرد و دەیگوت "ئەگەر ئەو نەبوایە رادەستی دەسەڵاتدارانی بەغدا دەکرامەوە، بەڵام ئەو رزگاری کردم. عەبدولموسەور باوەر بەو شتانە مەکە کە لە بارەی ئەو پیاوەوە دەوترێت"

کاتێك سەردانی ناوچەی پارێزراوم کرد، جارێکی تر سەردانی مام جەلالم کرد و نوسخەیەکم لە تێزی دکتۆراکەم بە زمانی عەرەبی پێشکەش کرد. گوتم: مام جەلال هەندێك رەخنەی تێدایە کە ئاراستەی تۆش کراوە. ئەویش گوتی عەبدولموسەور تۆ درۆ ناکەیت چ دەنوسیت بنوسە. هەروەها باسی ئەو گفتوگۆیەم کرد کە لە پەرلەمانی نەمسا سەبارەت بەو بابەتە ئەنجام دراوە، بۆیە تکام لێکرد خۆیان لە شەری ناوخۆ لابدەن، چونکە پێش ئەوەی بێمەوە شەرێکی ناوخۆ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان روویدا بوو.

هاورێکانمان لە نەمسا لە رێگەی گۆڤار و رۆژنامەکان و راپۆرتەکانی رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتیەوە ئاگاداری ئەو شەرە ناوخۆییە و کارە دزێوەکانی شەر بوون کە لە کوردستان روویان داوە. ئێستاش ئەو پزیشکی ددانەی کە هەموو سێ مانگ جارێك سەردانم دەکرد و حەزی بە گەنگەشەکردنی

کاروباری سیاسی بوو و زانیاریی فراوانی لەسەر رەوشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو، لەوانە لەسەر کێشەی کورد، هەر کە دەچوومە ژوورەوە بە سکرتێرەکەی دەوت هیچ سەردانێك وەرمەگرە تا دکتۆر عەبدولموسەور تەواو دەبێت.

دوای ئەوە یەکسەر دەست بە گفتوگۆ دەکراو پرسیاری دەکرد لە بارەی ئەو هەواڵانەی لە رۆژنامە و رادیۆکانو تیڤیەکانەوە بڵاو دەکرانەوە، سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان. جارێکیان پزیشکەکەم سەبارەت بە رەفتاری مەسعود گوتی: "ئەگەر باوك بزانێت کوڕەکەی چی دەکات ئەوە لە گۆڕەکەی دەتلێتەوە". مەسەلەکە پەیوەست بوو بە فرۆشتنی نەوتی عیراق لە رێگای تورکیاوە، وێڕای ئابلۆقەی نێودەوڵەتیی سەر سەدام و وێڕای ئەوەش کە سەدام براکانی کوشتوە. پزیشکێکی تر هەبوو کە یارمەتی دەدام بۆ ئەوەی سەرچاوەی پێویست بە دەست بێنم بۆ نوسینی نامیلکەیەك لەسەر چەکی کیمیایی، بەڵام زۆربەی ئەو کەسانە لەبەر باری ئەمنی حەزیان نەدەکرد ناویان بهێنرێت. ئەو پزیشکە رەزامەندیی دەربڕی بۆ پەیداکردنی سەرچاوەی پێویست کە من نەمدەتوانی لە کتێبخانەکاندا پەیدایان بکەم، ئەویش بەرامبەر بەوەی کە دوای تەواوبوون نوسخەیەکی بدەمێ. بێگومان ئێستا ئەو ترس و خۆپاراستنەی باسی دەکەین نەماوە، چونکە تیرۆریستان لە ئێستادا هەموو ئەو زانیارییانە لەسەر ئینتەرنێت بڵاو دەکەنەوە و هانی تیرۆریستان دەدەن بۆ ئەوەی خۆیان فێری چۆنێتی دروستکردنی چەکی کیمیایی بکەن.

پاش تەواو کردنی نامیلکەکە سەرچاوەکانم گەڕاندەوە بۆ پزیشکەکە، ئەو گوتی "ئێمە هاوسۆزین لەگەڵ کێشەی کورداندا"، لەو کاتەشدا ئاماژەی دا بەو ناکۆکیانەی نێوان رەوتەکانی کوردستان و رەخنەی لە هەندێك رەفتاری پارتی کرێکارانی کوردستان گرت. ئینجا باسی تێزەکەی منی کرد و گوتی ئەو تێزەی تۆ رێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی خەڵك بە ئاسانی لە کێشەی کورد تێبگەن، بەتایبەتی ئەوانەی کورد نین. پاشان گوتی پرسیارم لە هەندێ کورد کردوە سەبارەت بەو تێزی دکتۆرایەی تۆ، کەچی زۆر بە شێوەیەکی سەلبی هەڵیانسەنگاندوە، کاتێکیش لێم پرسیون ئایا ئێوە خوێندوتانەتەوە، گوتویانە

نەخێر نەمان خوێندۆتەوە گوتم ئەی چۆن بەو شێوە خراپە باسی دەکەن؟ وتیان پارتی دیموکراتی کوردستان فەرمانی کردوە کە نابێت ئەو کتێبە بخوێنینەوە. ئەو ناوی هەندێك لەو کەسانەی پێ گوتم. دەرکەوت هەموویان سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، پزیشکەکە زیاتر لە سەری رۆیشت و گوتی "ئەوە بە راستی سەیرە کە ئەو کەسانە بەو شێوەیە رەفتار بکەن، لە کاتێکدا ئەوانە ماوەیەکی دورو درێژە لە وڵاتێکی دیموکراتیدا دەژین و بەشدارییان لە چەندین هەڵبژاردنی پەرلەمانیدا کردووە و دەبێت ئاگاداری پرۆسەی دیموکراسی بن، کەچی ئەوانە لەبری ئەوەی رای خۆیان دەربڕن، راو هەڵسەنگاندنی خەڵکی تر وەردەگرن و دەیڵێنەوە". ئەو پرسی: ئەمانە بۆچی وا هەڵسوکەوت دەکەن؟ من گوتم: نامەوێت لە جیاتی ئەوان وەڵام بدەمەوە.

لە راستیدا ئەم پزیشکە باش و کراوەیە کە هاوسۆز بوو لەگەڵ کێشەی کوردا و نەیدەزانی زۆربەی حزبەکان سیاسەتی گێلکردن لە ئاستی گەلەکەیان بە گشتی و کادیرەکانی خۆیان بە تایبەتی پەیڕەو دەکەن، هەروەك چۆن چەندین رۆشنبیری کورد هەیە کە ژیانی خۆیان تەرخان کردوە بۆ خزمەتکردنی حزب. کەچی گەل و نیشتمانی خۆیان فەرامۆش کردوە. ئەگەر ئەو رەفتارە نەشیاوە نەبوایە، ئەوە هەندێك کەس نەیاندەتوانی چەندین جار ئاگری شەڕی ناوخۆ هەروا بە ئاسانی هەڵ بگیرسێنن. ئەو رۆشنبیرانە راستیەکان دەشارنەوە، داکۆکی لە وەهمێکی حزبی دەکەن کە هەر بوونی نیە و شکستەکانی حزبەکانیان دەکەنە سەرکەوتنی گەورە و لەولاشەوە وەهم و خیانەت دەکەنە نیشتیمان پەروەری. هتد، ئەوەش لەبەر ئەوەی ویژدانی خۆیان فرۆشتوە.

ئەو رۆشنبیرانە خزمەتکاری دیکتاتۆریەت و دوژمنی دیموکراسیەتن و لە سیاسەتدا تەنیا ئەوەیان بە لاوە گرنگە کە خۆشگوزەرانی خۆیان دابین بکەن. ئەمانە لە شەڕە ناوخۆییەکاندا دەوری کاریگەریان هەبوە چونکە لاوانی کوردیان دژی یەکتر هانداوە و بەکوشتیان داون.

لەو کاتەدا مەسەلەی  بارزانییە سەرنگومکراوەکان لە ئارادا بوو کە دەبو داکۆکییان لێ بکرێت. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم سێ کەس لە ناو هەموو بارزانییەکاندا لە هەموو ئەوانی تر خەمخۆری ئەو پرسە بوون ئەوانەیش: عەبدولسەلام بارزانی و ئەیووب بارزانی و من.

کێشەکە لەگەڵ دەستگیرکردنی عوبەیدوڵڵای بارزانی سەری هەڵدا، بەڵام سەدام بە بەخشینی پارە ئەوانی تری خاترجەم کرد. پارەکە هەندێك جار گەیشتۆتە ۳۰ هەزار دینار. هەندێك کەس ئەم پارە بەخشینەی وەك سەرەتای باشبوونی پەیوەندیی پارتی و حکومەتی بەغدا سەیر کردووە.

# مەسەلەی بارزانییە بێسەروشوێنەکان

لەبەر ئەوەی پرسی بارزانییەکانمان وەك نمونە باس کرد، هەرچەند تاکە پرسیش نیە، بەڵام دەبێت زیاتر تیشکی بخەینە سەر، وێڕای ئەوەش ئێمە لەو باوەڕە داین کە هەموو راستیەکان تائێستا ئاشکرا نەکراون، بەدوریشی نازانین پرسەکە لەوە گەورەترو تاڵتر بێت. لێرەدا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەروبەندی شەڕی عیراق ئێران، کە هەردولا هەوڵیان دەدا زۆرترین کەس بکەنە سوتەمەنی ئەو شەڕەو زیاترین توێژی کۆمەڵگە تێوە بگلێنن. ئەوان بە هەر نرخێك بووە دەیانوسیت لەو جەنگەدا سەر بکەون. بێگومان لەو سەروبەندەدا بێلایەنی باشترین چارەسەر بوو، بەڵام لەگەڵ دوربینیەکی دیپلۆماتیدا کە بتوانێت کارێکی وا بکات هەردولا ناچار بکات بە سازشی زیاتر لەگەڵ کوردان. دەشێت بڵێین هەڵوێستی بەغداد بەرامبەر پارتی دیموکراتی کوردستان باشترین بەڵگە بێت بۆ دروستیی ئەو قسەیەی ئێمە دەیکەین. حکومەتی عیراق پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد، هانی دا لەو شەڕەدا بێلایەن بێت، ئەوەش لە بەرامبەر بڕێك پارە و بەڵێندان بەوەی کە لە ئاییندەدا چارەسەری کێشەی کورد دەکات. بە پێی زانیارییەکان، بەغدا دو ملیۆن دیناری عیراقی، کە ساڵی ١٩٨٣ دەیکرد شەش ملیۆن دۆلاری ئەمریکی، داوەتە پارتی. ئەوەی ئەم نێوەند گیریەی کردووە عیزەت سلێمانی دەرگەلەیی بووە، ئەو تەنیا راو بۆچوونی هەردولای دەگواستەوە بۆ لایەکەی تر.

پارتی دیموکرات وەك نەریتی خۆی پارەکەی وەرگرتوە، بەڵام پابەند نەبوە بە بەڵێنەکەی و بێلایەن نەبوە، چونکە حکومەتی ئێرانیش پەیوەندیی پێیانەوە کردوەو و ئەویش پێشنیاری باشی بۆ کردون بە شێوەیەك نەیانتوانیوە رەتی بکەنەوە. بەڵام وردەکاریی پێشنیارەکەی ئێران نەزانراوە. لە ئەنجامدا پارتی بەشداریی کرد لە هێرشەکەی ئێران بۆ سەر حاجی ئۆمەران. ئەم کارەی پارتی بۆ هێزەکانی عیراق کە لەو شەڕەدا بەرەو رووی تێکشکاندنی خراپ بوونەوە،

مایەی شۆك بوو، عیراقییەکان وایان دانابوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان بێلایەن دەبێت. بێگومان عەسکەرییەکان دەزانن سوپرایز لە شەڕدا چەند مەترسیدارە. بۆیە سەدام ئەوەی دوبارە دەکردەوە کە پارتی "دوو جار خیانەتیان لە بەڵێنەکانیان کردوە". لە راستیدا کەس لەو قسانەی سەدام تێنەدەگەیشت چونکە زۆر نهێنی هەبوو کە ئاشکرا نەکرابوون و تا ئەو کاتە پەردەیان لەسەر لا نەدرابوو.

کاردانەوەی سەدام بە شێوەیەکی زۆر درندانە بوو. ئەو کە دەیزانی دەستی ناگاتە سەرکردایەتی پارتی دیموکرات کە تاکە بەرپرسی ئەو رەفتارە بوو، هات و ئەو بارزانییانەی دەستگیر کرد کە لە کامپەکاندا خۆی دابینابوون، وەك کامپی قوشتەپەو ئەوانی تر. ئەوان هەزاران کەس دەبوون. ئەو دەیگوت ئەوانە دیلی جەنگن و لە شەڕی حاجی ئۆمەراندا گیراون، ئەوەش بۆ ئەوە بوو پاساو بۆ بەزینی سوپای عیراق لە شەڕی حاجی ئۆمەران بهێنێتەوە. بەڵام خۆ هەموو ئەو بارزانییانە کەسانی سڤیل و بێتاوان بوون و قوربانیی ململانێیەك بوون کە ئەوان هیچ پەیوەندیەکیان پێوەی نەبوو. ئەم پرۆسەیە زۆر بە وردی پیلانی بۆ دارێژرا و لە ٣١ تەموزی ١٩٨٣ جێبەجێ کرا، هەزاران کەس بەرەو زیندانەکان راپێچ کران و لەوانەی تەمەنیان لە نێوان ١٠ تا ٧٠ساڵ دەبوو، هەندێك سەرچاوە ژمارەی قوربانیەکان بە ٨٠٠٠ کەس دەخەمڵێنێت و هەندێکی تر بە کەمتر.

دوای هەرەسهێنانی رژێمی پێشوو ئەو دیکۆمێنتانە دەرکەوتن کە باسی چارەنووسی ئەو بێتاوانانە دەکەن. دەرکەوت هەمویان لە زیندانەکاندا توند کراون و پاش چەند رۆژێك لە دادگا کارتۆنیەکانی رژێمدا بە کۆمەڵ چەندین حوکمی کارتۆنییان بۆ دەرکرا. ئەوانە دابەش کراون بەسەر چەند تاقمێکی پەنجا کەسی و لە نێوان ئەو پەنجا کەسەدا یەکێکیان دیاری کردوەو و ناویان لێناوە بەرپرسی شانەیەکی سیخوڕی کە خزمەتی ئێران دەکات، لە کاتێکدا ئێران لە جەنگدایە لەگەڵ عیراق.

سەبارەت بە ئێمە کە لە ئەوروپا بووین، ئەم هەواڵانە کۆستێکی گەورە بوو بۆمان و هەستمان بە گەورەیی کارەساتەکە کرد، بەتایبەتی کە دەمانزانی ئەوانە کەسانێکی بێتاوانن و هیچ پەیوەندیەکیان بەو روداوانەوە نیە، بەڵکو هیچ شارەزاییەکیان نەبوو لە پیلانگێڕیە بچوك و گەورانەش کە لە لایەن خەڵکانی ترەوە دەگێڕدران و ئەوان بە هۆیەوە ببونە قوربانی. ئێمەش لەسەر داوای کەسوکاری قوربانیەکان هەوڵی زۆرمان دا بۆ ئەوەی بتوانین پشتیوانی لە دۆزەکەیان لەسەر چەندین ئاست بکەین. هەر بەڕاستیش لە زۆر لایەنەوە هاوکاری کراین. دەتوانم لێرە ناوی دکتۆر کوردۆ سەروەت ببەم کە خەڵکی سلێمانی بوو. ئەو لە سەرەتادا دەیویست تێ بگات کە بۆچی دەمانەوێت هەرایەکی میدیایی گەورە لەو بارەوە بەرپا بکەین. من گوتم: بە لای منەوە پرسی بارزانییەکان کۆتایی پێ هاتوە بەڵام ئەگەر لەم کارەساتە بێدەنگ بین ئەوا کارەساتی گەورەتری بەدوادا دێت، لەبەر ئەوە بڕوا بە قسەکەم بکە. ئەو خۆی و هاوەڵەکانی بەو توانا میدیاییە کەمەی هەیانبوو هاوکاریی باشیان کردین. هەروەها دکتۆر جەواد مەلا لە کوردستانی سوریا، ئەویش بە پێی توانای خۆی هاوکاریی کردین.

کاتێکیش سەردانی ئێرانمان کرد لەوێش ئەم پرسەمان لە رێگەی نوسینی بەیاننامەیەکەوە وروژاند. لەو کاتەدا قسەی ئەوە هەبوو کە بارزانییەکان بۆ سودان دور دەخرێنەوە، هەر لەم بارەیەوە قسە لەگەڵ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی و رێکخراوی مافەکانی مرۆڤیش کرا، لەگەڵ چەندین دەزگای راگەیاندنیش پەیوەندیم کرد، بەڵام کاردانەوەی لایەنەکان چاوەڕواننەکراو و نائومێدبڕ بوو. لە ئاستی ئەو تاوانە گەورەیە کە جینۆسایدێکی گەورە بوو، وای دەخواست لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بهاتنایەتە دەنگ و بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان مامەڵە لەگەڵ ئەو تاوانەدا بکرابایە.

هەڵوێستی دەزگاکانی راگەیاندنی نەمسایی زۆر بێئومێدی کردین، رۆژنامەکان و تەلەفزیۆن هاودەنگییان لەگەڵ نەکردین. هەرچەندە بەڕێز هاوزەر

نێوەندگیریی بۆ کردین لای بەرپرسی ڕۆژنامەوانی بەڵام وەڵامەکانیان تەواو بێئومێدیان کردین. لە کاتی پەیوەندیەکی تەلەفۆنیماندا ئەو خانمەی بەرپرس بوو لە ڕۆژنامەوانی بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە (زوو ئەو هەواڵەمان پێگەیشتوە و ئاگادارین، بەڵام دەبێت ئێوە ئەوە جێبەجێ بکەن کە سەدام پێتان دەڵێت، ئەگەر وا نەکەن ئەوە شایستەی هەر سزایەکن کە سەدام پێتان ڕەوا دەبینێت).

ئەم هەڵوێستە تەنیا هەڵوێستی نەمسا نەبوو بەڵکو ڕەنگدانەوەی هەڵوێستی هەموو وڵاتانی خورئاوا بوو، هەڵوێستێکی نا ئەقڵانی و دور لە هەر یاسایەکی نێودەوڵەتی بوو. لێرەوە هەڵوێستی ئەو وڵاتانە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەرکەوت، کە شەڕی عیراق– ئێران زەقترین پێشڕەفتی ئەو هەڵوێستانە بوو. هەڵوێستی پشتگیری کردنی ئەو وڵاتانە بە ئاشکراو نهێنی لەو هێرش و پەلامارەی عیراقی فاشیست کردیە سەر ئێران، ئەو ڕژێمەی بە ئاشکراو نهێنی تاوانی جینۆسایدی ئەنجام دەداو سەرچاوە هەواڵگریەکانی خۆیشیان بە ووردی ئاگاداری ئەو تاوانانە بوون، لەوانەش بەکارهێنانی چەکی کۆکوژو کیمیایی دژی خەڵکی سڤیلی کوردستان و ئێران و هەندێك جاریش دژی سوپای ئێران. لە کاتێکدا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بە پێی هەموو یاسا نێودەوڵەتیەکان قەدەغەکراوە، بەڵام ئەو وڵاتانە پێیان باش بوو خۆیان لەو هەموو تاوانانە گێل بکەن، تەنیا بۆ تێکشکاندنی ئێران، کە لە گەشەکردنی هێزو دەسەڵاتەکەی دەترسان ئەگەر بهاتبایەو عیراق شکستی بهێنایە. هەروەها چاوی خۆیان داخستبوو لەوەی عیراق لە کوردستان ئەنجامی دەدات بە هۆی ئەوەی هەندێك حزبی کوردی هاوکاری تارانیان دەکرد. هەروەك چۆن ئەمریکا پاڵنەرێکی تریشیان هەبوو بۆ ئەم دژایەتیکردنە، ئەویش بە هۆی ئەوەی لە سەرەتای شۆڕشدا باڵوێزخانەکەیان لە تاران داگیر کرا لە لایەن خوێندکارە ئێرانیەکانەوە. تێبینیش دەکرێت کە هەردوولای بەشەڕهاتوو هەندێ جار هاوکاریی سەربازییان پێگەیشتوە، ئەوەیش بە مەبەستی بەهەدەردانی هێز و توانای هەردوو لایەن، هەرچەندە بەغدا زۆرترین پشتگیریی وەرگرتوە.

بێگومان ئەم پشتیوانیکردنە لە رژێمێکی فاشیست هەموو ئەو وڵاتانە دەکاتە هاوبەش لە هەموو ئەو تاوانانەی لە لایەن دەسەڵاتی فاشیستی بەغداوە ئەنجام دراون، چونکە هەر ئەوان ئەو چەکە کۆکوژانەیان دەدا بە بەغدا و لە تاوانەکانیشی بێدەنگ دەبوون و هیچ سنورێکیان بۆ دەستدرێژییەکانی دانەدەنا. تاوانی جەنگ، تاوانی دژی مرۆڤایەتی. تەنیا کاتێك لێی هاتنە دەنگ کە هەستیان کرد ئەم رژێمە بۆتە هەڕەشەیەك لەسەر ئاسایشی خۆیان. دوای ئەوە ئینجا هەڵسان بە سزادانی ئەو رژێمە دڕندەیە.

لە راستیدا ئەم هەڵوێستە پڕ شەرمەزاریەی خۆرئاوا سەدامی زیاتر هاندا بۆ ئەوەی تاوانی زیاتر ئەنجام بدات. چونکە سەدام بێدەنگیی خۆرئاوای بەوە دەخوێندەوە کە ئەوان لە رەفتارەکانی رازین. هەر ئەو هەڵوێستەش بوو وای کرد عەلی حەسەن مەجید (عەلی کیمیایی) بە ئاشکرا سوکایەتی بەرێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بکات و بڵێت "هەموویان بە چەکی کیمیایی لەناو دەبەم، با بزانین کێ قسە دەکات؟ واو وا لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکەم، هەروەها وا و وا لەوانەش دەکەم کە گوێ لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەگرن". بڕوانە هیلتەرمان (کاری ژەهراوی، ئەمریکا و عێراق و بۆردومان کردنی هەڵەبجە بە گاز) تەرجەمەی کوردییەکەی لە لایەن محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق، بڵاو کراوەکانی ئاوێنە/ سلێمانی، ۲۰۰۷، ل ۱۲۷.

هەروەها تاریق حەننا عەزیز بە راشکاوی بەڵام بێ ئەوەی ناوی چەکی کیمیایی بەرێت وتویەتی "ئەگەر پێویست بەوە بکات کە هەمو جۆرە چەکێك بەکار بێنین، ئەوە بێ ئەوەی گوێ بە هیچ رێککەوتنامەیەك بدەین بەکاری دێنین و گوێ بۆ قسەی کەسیش شل ناکەین، چونکە لەم جەنگەدا ئێمە لە پێناوی هەموتاندا دەجەنگین". بڕوانە یۆست هیلتەرمان، سەرچاوەی پێشوو.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە هەوڵێك بکەین کە ئەنجاممان دا بۆ ئەوەی تاوانی جینۆسایدی کوردستان لەبەردەم ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان بوروژێنین. من و خەلیل ئیبراهیم بارزانی سەردانی وەزارەتی دەرەوەی نەمسامان کرد لە ڤیەننا و داوامان کرد لەگەڵ وەزیری دەرەوە

چاوپێکەوتنێك ساز بکەین، بەڵام کارمەندانی وەزارەت پێیان ڕاگەیاندین کە داوای دیدار لەگەڵ وەزیری دەرەوە بەلایەنی کەمەوە هەفتەیەك دەخایەنێت، بۆیە لەبری ئەوە پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردین چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسیاری بەشی کاروباری خۆرهەلاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوە بکەین. جا لەبەر ئەوەی کات بەلای ئێمەوە گرنگ بوو، پێشنیارەکەمان پەسەند کرد چونکە لەو کاتەدا نەمسا ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایش بوو. وەڵامدانەوەی نەمسا زیاتر موجامەلەو دیپلۆماسی بوو. لە کاتێکدا تێگەیشتنی خۆیان بۆ ڕەوشی ناوچەکە دەربڕی بەڵام وەڵامەکەیان ڕەتکردنەوەی داواکەی ئێمە بوو. لێپرسراوەکە وتی "حکومەتی نەمسا لە وروژاندنی ئەم بابەتەدا دەستپێشخەر نابێت، بەڵام بێگومان دووەم کەس دەبێت ئەگەر لایەنێکی تر بیوروژێنێت".

## لەهەموو دەرگایەکماندا بەڵام هەمووی بە داخراوی مانەوە

ئەیوب بارزانی یەکەم کەس بوو نامیلکەیەکی بە زمانی ئینگلیزی نوسی و بە گوێرەی توانا بڵاومان کردەوە. دوای ئەویش ئینجا سەرەی من هات، هەرچەند هەندێك دواکەوتم. منیش لە بارەی کێشەی بارزانییەکان و هەڵەبجەوە بە زمانی ئەڵمانی نامیلکەیەکم نوسی. نامیلکەکە وەریگێڕدرایەوە سەر زمانی تورکی و ئینگلیزیش.

یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و خەڵکی هەولێریش هەوڵیاندەدا هاوکاریی پاشماوەی بارزانییەکان بکەن کە زۆربەیان ژن و منداڵی بچوك بوون. زۆر لە بارزانییەکان باسی ئەوەیان بۆ کردوم کە پەیوەندییان بە جەلال تاڵەبانییەوە کردوە بۆ هاوکاری، ئەویش هاوکاریی کردون. خەڵکی هەولێریش بە شەو خواردن و پێداویستییان دەگەیاندە بارزانییەکان و بە ڕۆژیش کاروباریان بۆ دابین دەکردن. بەڵام ئەزمونم لەگەڵ پارتیدا کە پاش سەددام رووی دوەمی کێشەی بارزانییەکان بوو، بەراستی ناخۆش و نائومێدکەر بوو. پارتییەکان لە جیاتی هاوکاری کردن ڕێگرییان لێ دەکردین. تەنانەت پێش لە سێدارەدانی

سەدامیش، هەوڵیاندەدا فشار لەسەر خەڵك بکەن بۆ ئەوەی ناوی بارزان تکریتی لە شایەتیەکانیاندا نەهێنن. هەرچەند بارزان تکریتی سەرۆکاری هەڵمەتی ٣١ تەموزی ١٩٨٣ی کردبوو و لەکاتی هەڵمەتەکەی قوشتەپە کە هەزاران بارزانی دەستگیر کران خۆی لەوێ بوو. بەڵام بۆچی پارتی نەیدەویست ناوی بارزان بهێنرێت؟!

خۆم یەکێك لەو نمونانەم لایە کە رێگرییان دەکرد. لە ڤیەننا دوو کەس سەردانیان کردم و گوتیان دەیانەوێت لەسەر مەسەلەیەکی گرنگ قسەم لەگەڵ بکەن. دوایی دەرکەوت کە ئەوان لە لایەن سەباح مەحمود ئاغا زێبارییەوە رەوانە کراون بۆ ئەوەی پێم بڵێن دەست لە بابەتی بارزانییەکان هەڵبگرم، چونکە ئەوە داواکاری پارتی دیموکراتی کوردستانە، منیش پێم گوتن بەو زەلامە بڵێن کە بە هیچ شێوەیەك دەست نەخاتە کاروباری منەوە، ئەمە یەکەم، دوەم کێشەی بارزانییەکان پەیوەندیی بەو حزبەوە نیە، چونکە بارزانییەکان پارتی نەبوون، سێهەمیش خزم و کەسی قوربانییەکان داوایان لە ئێمە کردوە هاوکاریان بکەین، ئێمەش پابەند دەبین بە بەڵێنەکانمانەوە، ئینجا بە روونی پێم گوت من هەر جۆرە خۆسەپاندنێك رەت دەکەمەوە، بەتایبەتی لە بڕیارە سیاسیەکانمدا. پارتی دیموکراتی کوردستان دوا لایەنە مافی ئەوەی هەبێت دەست بخاتە کاری منەوە یان تەنانەت بیر لە شتی واش بکاتەوە، تەنانەت ئەو کەسەش کە داوای لێ کردون ئەو هەواڵە بگەیەنن، هیچ مافێکی نیە قسە لەم مەسەلەیە بکات.

لە ساڵی ١٩٩١ دا لە کاتی دانوستانی نێوان بەرەی کوردستانی و رژێمی بەعس، لە رێگەی ئەندامێکی پارتییەوە پێمان راگەیەنرا کە مەسعود بارزانی چەند هەزار سەر مەڕێکی لە سەدام وەرگرتوە وەك قەرەبوویەك بوو ئەم مەسەلەیە، ئەمە بێجگە لەو پارەیەی وەریگرتوەو کەس نازانێت چەندە. ئەم کارە لای عەرەب پێی دەوترێت "فەسل" واتە خوێنبایی. واتە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دو لایەنی ناکۆك لە رێگەی پێدانی خوێنباییەوە واتە هەقی خوێن بۆ ئەوانەی کەسەکانیان کوژراون و زۆر جاریش لە جیاتی کوژراوەکان مەڕ و

ماڵات دەدرێت. ئەو لایەنەی ئەو خوێنباییەش وەردەگرێت، واتە دەستی هەڵگرتوە لە مافەکانی خۆی، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر لە نێوان ئەو دو لایەنەدا شەڕێکی تر روویداو ئەمجارەیان شەڕەکە لە لایەن کەسوکاری کوژراوەکەوە بێت، ئەوە ئەو کەسە وەك دەستدرێژیکەر دەناسرێت لەم بارەدا.

پرسیارەکە ئەوەیە. کێ رێگەی بە مەسعود داوە کارێکی لەم شێوەیە بکات؟ ئەی بۆ بارزانییەکان پێی ناڵێن چەندی لەبری ئەوان وەرگرتووە؟ ئەی بۆ ئەو پارەیە نادات بە کەسوکاری قوربانییەکان؟

دوای تەواوبوونم لە تێزی دکتۆراکەم، فازڵ مەلا رەسول پەیوەندیی پێوە کردم بۆ ئەوەی تێزەکەی خۆمی بدەمێ تاکوو سودی لێ وەربگرێت بۆ دکتۆراکەی خۆی وەك سەرچاوە. لەم دیدارەدا فازڵ باسی مەسەلەی بارزانییەکانی کرد لە یەکێتی سۆڤیێت. گوتی: دکتۆر، ئایا دەزانیت مەلا مستەفا لە دوا سەردانی بۆ یەکێتی سۆڤیێت بە یەکجار موچەی خانەنشینیی هەموو ئەو بارزانییانەی وەرگرتوە کە لە یەکێتی سۆڤیێت ژیاون؟ ئەی ئاگاداریت ئەگەر ئەو موچانە درا بێت بە بارزانییەکان دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا؟

منیش گوتم: کاك فازڵ ئاگام لە هیچ کامیان نیە. لەو بارەوە هیچ زانیاریەکم نیە؟

ئەو گوتی: باوەڕ بکە شتی وا روویداوە. من ئەو بابەتەم لە کاتێکدا زانیوە کە خەریکی گەڕان بووم بە شوێن زانیاریدا بۆ تێزی دکتۆراکەم.

بەهەر حاڵ، دوای وەرگرتنی مەڕ و ماڵات، داوا لە بارزانییەکان کراوە جارێکی تر باسی ئەم بابەتە نەکەنەوە چونکە ئەم بابەتە کۆتایی پێ هاتوە.

یەکێك لە ئەندامانی پێشووی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەو هەواڵە بە ئەیوب بارزانی گەیاندبوو و چەند سەرچاوەیەکی تریش هەواڵەکەیان پشتڕاست کردبۆوە. ئەو کەسەش خۆی ناڕازی بوو لە وەرگرتنی ئەو مەڕو ماڵاتە چونکە پێی وابوو ئەمە زیان بە پرسی بارزانییە سەرنگومکراوەکان دەگەیەنێت.

بە کورتی، بێجگە لە بەشداری نەکردن لە رشتنی خوێنی کوردان، ئێمە هیچ کەمتەرخەمییەکمان بۆ پشتیوانیکردن لە پرسی نەتەوەکەمان نەکردووە. هەردەمیش خۆمان لەو شتانە بەدور گرتووە کە زیان بە پرسی نەتەوەکەمان دەگەیەنن.

لە راستیشدا دەتوانین بڵێین، ئەوەی ئێمە وەك کارێکی تاکە کەسی ئەنجاممان داوە بۆ ئەوەی دۆزی رەوای گەلەکەمان بەگەلی ئەڵمانیا بناسێنین، زیاترە لە هەموو ئەو کارانەی کە حزبەکان بەسەر یەکەوە کردوویانە لەو بارەوە، بەتایبەتی ئەگەر بزانین کە بە هیچ شێوەیەك هانی برركوژیمان نەداوە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە هەمیشە دژی ئەو کارە نارەوایە وەستاوینەتەوە. دەشێت ئەو نامیلکەیەی بڵاومان کردەوە: "دۆزی کورد رێگرەکانی بەردەم چارەسەرەکانی دیموکراسی" باشترین گوزارشت بێت لەوەی ئێمە دونیابینیەکی دیموکراسیمان لە کاری سیاسیدا هەیە و هەوڵمانداوە خەڵکانی تریش هان بدەین بۆ ئەوەی هەمان رێگە بگرنە بەر.

بێگومان بە پێی توانا کەمتەرخەمیشمان نەکردوە لە پشتیوانیکردنی دۆزی نەتەوەکەمان لە پارچەکانی تریش. لە پێش هەموشیانەوە کوردستانی تورکیا. ئەو تێزەی ئێمە هەموو پارچەکانی کوردستانی لەبەرچاو گرتبوو. پاش رفاندنی عەبدوڵلا ئۆجەلانیش نامیلکەیەکمان بڵاو کردەوە، لە پێشەکیدا ئاماژەمان بەوە کرد کە ئەم نامیلکەیە داکۆکیکردنە لە دۆزێك نەك لە کەسێك.

لەسەر داوای دکتۆر عیزەت ئەفەندی لە سوریا، هەوڵماندا هاوکاریی پارتی کرێکارانی کوردستان بکەین لە رووی رێکخستنەوە، بەڵام دەرکەوت ئەوان نایانەوێت لەگەڵ هەڵگری بروانامەکاندا مامەڵە بکەن.

وێرای هەمو شتێك، من لەو باوەڕەدام پارتی کرێکارانی کوردستان هەڵەی گەورەی کردوە کە دواجار بوە هۆی ئەوەی تۆمەتی تیرۆریان پێوە بلکێنرێت، وەك ئەوەی هەندێکیان پەلاماری سەنتەرێکی سەر بە پارتی سۆسیالیستی ئەڵمانیایان دابوو، لە کاتێکدا کە ئەو حزبە لەو کاتەدا دەسەڵاتدار بوو و ئامێری کۆمپیوتەر و تەلەفیزیۆن و کەلوپەلەکانیان لە نهۆمی سێهەمەوە فرێ دابوە

سەر شەقامەکە. لەو کاتەشدا کامێراکانی تەلەفزیۆن وێنەی ئەو روداوەیان دەگرت. بەڵام ئەو پارتە توانیویەتی شانازیکردن بە کوردبون و کوردایەتی بۆ کوردانی تورکیا بگێڕێتەوە. یەکەم حزبیشە کە رەهەندەکانی کاریگەری راگەیاندنی زانیبێت و هەوڵەکانی تورکیای بۆ لە ناوبردنی زمانی کوردی خستە گۆڕەوە، ئەویش لە رێگەی دامەزراندنی یەکەم کەناڵی ئاسمانییەوە بە زمانی کوردی.

بێگومان بە هۆی کەمیی کادیری میدیاکارەوە لەناو ئەو پارتەدا، مۆرکی سادەیی پێوە دیار بوو. لە کۆڕێکدا کە ئێمەش بانگهێشت کرابووین، یەکێکیان دەستی کرد بە قسان وەك نوێنەری ئۆجەلان و گوتی من لە کوردەکانی لوبنانم، ئینجا دەستی کرد بە باسکردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی حزب، گوتی ئەگەر حزب بیەوێت دەتوانێت فڕۆکەی جەنگی و تانکی نوێ بەدەست بێنێت. ئەم قسانە ریکلامەکانی پارتیی لە ساڵی ١٩٧٤ وەبیر هێنامەوە کە دەیگوت فڕۆکەی کوردیمان هەیە و بەرەنگاری هەر هێرشێکی ئاسمانیی عێراق دەبینەوە. تەنانەت جەوهەر هیرانی وەردەکاریی زیاتری لەو بارەوە دەدا و دەیگوت کلکەکەیشی رەشە.

ئامادەبووان زۆرینەیان کرێکاری کورد بوون و هاتبوون بۆ کارکردن لە نەمسا و بە شوێن پارووە نانێکدا دەگەڕان و زۆریەی هەرە زۆریان نەخوێندەوار بوون، زۆر بە سەرسامیەوە گوێیان لەو گوتارە گرتبوو کە باسی هێزی نەبینراوی حزبی دەکرد. بەداخەوە من خۆم پێ نەگیراو لەو بەرێزەم پرسی: ئایا دەتوانیت یەك دەوڵەتمان پێ بڵێیت لەوانەی ئامادەن چەکی قورستان بدەنێ؟

ئەو بە تورەیی گوتی ئەلبانیا. منیش گوتم: بەرێزم، ئەلبانیا یەکێکە لە هەژارترین وڵاتانی جیهان و خەڵکەکەی لەبرسان دەمرن، ئیتر ئەو فڕۆکەو تانکە نوێیانەیان لە کوێ بوو کە تۆ باسیان دەکەیت؟

وێرای ئەوەش پەیوەندیمان لەگەڵ هەموو پارچەکانی کوردستان بەردەوام بوو ئەوەش رێگەی خۆش کرد بۆ ئەوەی یەکەم ئاهەنگی نەورۆز لە ڤیەننا بە ئامادەبوونی کوردانی هەموو پارچەکان هەڵبگیرسێنرێت. لە راستیدا دکتۆر

عوبێد و براکانی ڕۆڵی گەورەیان لە سەرکەوتنی ئەو ئاهەنگەدا گێڕا. ئەوان لە کوردانی سوریا بوون، کاتێکیش ئاهەنگەکە کۆتایی پێ هات، تەلەفزیۆنی نەمسا داوای چاوپێکەتنێکی کرد و منیش دەستنیشان کرام بۆ ئەو چاوپێکەوتنە. لەو کاتەدا دکتۆر عوبێد بردمیە لاوەو داوای لێکردم کە بە ناوی هەموو پارچەکانی کوردستانەوە قسە بکەم و باسی پرسی بارزانییەکان نەکەم چونکە ئاهەنگەکە بە ناوی هەموو کوردەوە کراوە و دەبێت قسەکانیش هاوشێوەی کارەکە بن. منیش ڕەزامەندیم لەسەر پێشنیارەکەی دەربڕی.

هەر کە دەستمان کرد بە قسە ئەو خانمەی دیبەیتەکەی بەڕێوە دەبرد ڕووی کردە هاوڕێکانی گوتی: دواجار کەسێك هەیە بتوانێت باسی پرسی کوردمان بۆ بکات. بڕیار بوو چاوپێکەوتنەکە دوای دو ڕۆژ بڵاو بکرێتەوە، بەڵام ئەوە ڕوونەدا. پاش هەواڵپرسین، بەرپرسە نەمساویەکان پێیان ڕاگەیاندین کە بەردەوام پەیوەندیی تەلەفونییان لە لایەن کەسانی نەناسراوەوە بۆ کراوە، زیاتر لە هەزار تەلەفۆن، داوای ئەوە دەکەن چاوپێکەوتنەکە بڵاو نەکرێتەوە. کێ لە پشت ئەو پەیوەندییانەوە بوە؟

لە ڕاستیدا ناسنامەی ئەو کەسانە ئاشکرا نەبوو چونکە خۆیان نەناساندبوو، بەڵام وا دەردەکەوێت کە ئەوان سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بن.

# هێرشە تیرۆریستییەکانی ١١ی سپتەمبەر

ساڵی ١٩٩٦ ئەو ساڵە بوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان پەنای بردە بەر سەدام بۆ داگیرکردنی هەولێر. هێزەکانی سەدام پەلاماری ئۆپۆزیسیۆنی لەو شارە داو زۆری لێ کوشتن، پارتی دیموکراتی کوردستانیش لەم کارەیدا هاوکارییان دەکردن و ئەدرەسی شوێنەکانیان دەدانێ بۆ ئەوەی ئۆپۆزیسیۆن بە کۆمەڵ دەستگیر بکەن و بیانکوژن، ئەمە بێجگە لە تۆپبارانکردنی پەرلەمان بە تۆپ و تانك.

بیرۆکەی ڕۆیشتن و نیشتەجێبوونم لە ئەڵمانیا لە لایەن ئەندازیار عەلبدولموئمینی برامەوە باس کرا کە خۆی لەوێندەر دەژیا، هەروەها کوڕەکانی عەبدولسەلامی برایشم دکتۆر راستیار و ئەندازیاری کشتوکاڵی یەعقوب لەوێ بوون. ئەوەش بە مەبەستی ئەوەی لە کاتی پێویستدا لێکەوە نزیك بین.

دە ساڵم لە ئەڵمانیا بەسەر برد، پێش ئەوەی ساڵی ٢٠٠٥ بێمەوە بۆ کوردستان. لە ئەڵمانیا پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێکانمدا بەردەوام بوو. لە سویسرا و دانیمارك و ئەڵمانیا دیداری زۆرمان دەکرد، لەو دیدارانەدا باسی پرسەکانی ڕۆژمان دەکرد و هەر لەوێش هەردو نامیلکەکەم نوسی، لەبارەی عەبدوڵلا ئۆجەلان و چارەسەری دیموکراتی. لە کوردستان ڕەوشەکە بێ گۆڕانکاری مابۆوە. ململانێ ناوخۆییەکان هەر بەردەوام بوون، خوێنی لاوانی کورد بە خۆڕایی دەڕژا. بەلأم ئەو ڕەوشە ڕێگر نەبوو لەوەی سەرکردەکانی کورد لە ریستۆرانت و هۆتێلەکانی ئەوروپا پێکەوە شەوانێکی خۆش بەسەر بەرن، وەك ئەوەی هیچ شتێك رووی نەدابێت. ئەم حاڵەتە جەنگی یەکەمی جیهانی دێنایەوە بیرم، کاتێك ڕۆژنامەنوسێك لە بەرەکانی جەنگەوە لە ناو سەنگەرەکانەوە نوسیبوی: لە بەرەکانی جەنگدا هیچ شتێك نیە! لە کاتێکدا سەربازەکانی هەردوو لا دەکوژران، کەچی ئەفسەرەکان، تەنانەت دیلەکانیشیان وەك هاوڕێ دەبینی.

لەو کاتەشدا رەخنە گرتن لە سەرکردەکانی کورد بەردەوام بوو چونکە نەیاندەتوانی لەگەڵ روداوەکاندا هەنگاو بنێن. دوای دەستگیر کردنی ئۆجەلان بیرم دێت رۆژنامەنوسێك پرسیارێکی ئاراستەی گوتەبێژی فەرمیی کۆنگرەی پارتە سۆسیالیستەکان کرد لە سویسرا سەبارەت بە چارەنووسی پرسی کورد. ئەو گوتی: "هیچ نابێت. بڕوانە کوردانی عێراق، ناوچەی پارێزراومان دانێ و بە گوێرەی توانا هاوکاریشیان کردن. بەڵام چییان کرد"؟

لە راستیدا من لە تێزی دکتۆراکەمدا باسی ئەوەم کردەوە کە دەبێت کۆمەڵگەی کوردی خۆی بگۆڕێت تاکوو بتوانێت لەگەڵ گیانی سەردەمدا بگونجێت و سەرکەوتن بە دەست بێنێت.

ئێمە لەو باوەڕە داین کە دیموکراسیەتی راستەقینە هیچ ئەلتەرناتیڤێکی نیە، تا ئەو کاتەی سەرکردایەتیی کورد دیلی دەستی داب و نەریت بێت لە کاروباری سیاسیدا، بەتایبەتیش مەبەستمان لە ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتە لە رێگەی چەکەوە لەبری ئەوەی لەرێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە بێت. تا ئەمە روو نەدات، هیچ هیوایەکمان بە گۆڕانکاری نیە.

لە ئەڵمانیاش درێژەمان دا بە دۆزی بارزانییەکان، لە کاتێکدا پارتی دیموکراتی کوردستان هەوڵیدەدا دۆزەکە کۆتایی پێ بێنێت. ئێمە پشتگیریی ئەو لایەنانەمان دەکرد کە هەوڵیان دەدا سەرکردەکانی بەعس، بەتایبەتی بارزان تکریتی راپێچی دادگا بکەن، لەکاتێکدا پارتی هەوڵیدەدا تاوانەکانی داپۆشێت. ئێمە لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە مەبەستمان لەم کارە ئەوەیە دادپەروەری بەرقەرار بێت، نەك تۆڵەکردنەوە. وەك کۆنفۆشیۆس دەڵێت (پێش ئەوەی دەست بکەیت بە گەشتی تۆڵەسەندنەوە، گۆڕەکەی خۆت هەڵ بکەنە). منیش حەزم بەو بۆچوونەی ئەو هەیە.

بۆیە پێویست بوو بگەڕێمەوە بۆ کوردستان تاکوو بتوانم بەڵگەو شایەتەکان کۆ بکەمەوە، بەڵام زۆرینەیان دەترسان شایەتی بدەن لە ترسی رادەست کردنیان بە بەغدا.

لە ئەنجامی سەردانەکانمدا لە ئەڵمانیاوە بۆ کوردستان، هەوڵمدا پێداگری لەسەر دو شت بکەم: دروستکردنی خانویەك لە بارزان، ئەوەش پاش ماوەیەکی درێژ بەدی هات، دوەمیان یەکلاکردنەوەی مەسەلەی میرات، ئەوەش پرسێك بوو کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ چارەی نەبوو چونکە هەندێك کەس هەوڵیاندەدا ئێمە لە مافەکانی خۆمان بێبەش بکەن، هەندێکی تر میراتەکەیان وەك کارتی فشار بەکار دێنا بۆ ئەوەی سازشی سیاسی لەسەر بکەن لەگەڵماندا، ئەوەیان لە لایەن مەسعود و کەسە نزیکەکانیەوە ئەنجام دەدرا، هەندێکی تر دەیانویست بەو گەمە قێزەونە لە لایەن مەسعودەوە پاداشت بکرێن. هەرچەند ئێمە بە نەرم و نیانی هەڵسوکەوتمان دەکرد، بەڵام ئەو لە سەرەتاوە تا کۆتا سور بوو لەسەر ئەوەی دەبێت مەسەلەکە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە چارەسەر بکرێت. بەڵام مەسەلەکە مەسەلەی دادپەروەری نەبوو، بەڵکو شتی تری لە پێشەوە بوو سەبارەت بەو قسانەی بە ناوی ئێمەوە دەکران، لە راستیدا هیچ بنەمایەکی راستی یاسایی و شەرعیی نیە. دواجار لە دوا دیدارم لەگەڵ شێخ محەمەد خالید بارزانی پێی راگەیاندم ئەو کەسانەی ئەو ئاستەنگانەیان بۆ دروست کردووە هەندێك زانای ئایینیان هێنابو بۆ بارزان، جا لە رێگەی تەماح خستە بەر بوو بێت یان بە هەڕەشە و چاوسورکردنەوە بوو بێت، بۆ ئەوەی فەتوا دژی ئێمە دەربکەن. بەڵام ئەو زانا شەریفانە کەسیان ئامادە نەبوون ویژدانی خۆیان بفرۆشن یان مل کەچ بکەن بۆ ترساندن. دواجار زانا ئاینییەکان هیچ دەرفەتێکیان نەمابوو تەنیا ئەوە نەبێت پەنا بەرن بۆ شێخ محەمەد خالید بارزانی. تێیان گەیاندبوو کە چی روو دەدات، پێیان وتبوو ئەوان ئامادە نین فەتوایەك دەربکەن کە هیچ شەرعیەتێکی نیە، تەنیا لەپێناوی هەندێك ماڵی دونیا، داواشیان لێ کردبوو خۆی بڕیار بدات، شێخیش هەڵوێستێکی دروستی وەرگرتبوو و پشتیوانیی لە زانایان کردبوو.

ئەوەش سەرکەوتنێکی سەرەتایی بوو کە دوژمنانی بێچارە کرد و یەکلاکردنەوەی پرسەکەش تەنیا مەسەلەی کات بوو، کە لە گەڕانەوەمدا بۆ کوردستان ساڵی ٢٠٠٥ ئەو کاتە هاتە پێش.

## ١١ی سپتەمبەر وەرچەرخانێکی گەورە

بەهۆی هەڵە زۆر و گەورەکانی سەرکردایەتیی کورد، بێئومێدی باڵی بەسەر زۆربەی کوردا کێشابوو و وێنەی ئەو هەڵانەش کە هەندێکیان تاوانی گەورە بوون، رەنگی دابۆوە لە گەڕانەوە بۆ هەڵەکانی رابوردوو لەبری ئەوەی پەندی لێ وەربگرن، وەك پەنابردن بۆ دوژمن بۆ بچوککردنەوەی نەیارەکان، بۆیە رێگە درا بە دەستوەردانی تورکیا و سەدام و ئێرانیش. تورکیا لە شیلادزێ و ئامێدی و بامەڕنی و بەرواری باڵا چەند بنکەیەکی سەربازیی دانا کە تا ئێستاش هەر ماون. ئەو دەستوەردانەی تورکیا وای کرد چەندین داب و نەریتی کۆنی بەسەرچوو زیندو ببنەوە، کە کەسانی سادەی وەك من لەو باوەڕەدا بوون لەناو چوون وەك ئەوەی کوردان گوێی هەندێك کەسی خۆیان بڕن و رادەستی تورکەکانی بکەن بە نرخێکی هەرزان، وێڕای شێواندنی تەرمی کوژراوەکان، تەنانەت سوتاندنی ژن و منداڵان لە ناو پەناگەکاندا، ناڵێم ماڵەکانیان چونکە لە راستیدا ئەوانە ماڵ نەبوون. هەموو ئەم تاوانانە لە شوێنێکدا ئەنجام دەدران وەك شوێنێکی پارێزراو کە رادەستی ئەو سەرکردانە کرابوو و هێزە نێودەوڵەتییەکان دەیانپاراست، بۆ ئەوەی پێشکەوتن لەو ناوچەیە روبدات و لە رووی دیموکراسیەوە ببێتە نمونەیەك تاکوو ئەوانی تر لاسایی بکەنەوە، بەتایبەتی عیراق. بەڵام پێدەچێت خودا جارێکی تر بەزەیی بەکوردا هاتبێتەوە و وێڕای هەڵەی سەرکردەکانیان ئەمجارە لە دەرەوە روداوگەلێکی وەها روویدا کە دەریچەیەکیان بۆ کرایەوە تاکوو بتوانن جارێکی تر هەناسە بدەنەوە.

بەیانیی ١١ی ئەیلول ٢٠٠١ خەریکی کاری خۆم بووم لە ئەڵمانیا. لەو کاتەدا ئەڵمانییەك بەلامدا تێپەڕی و گوتی: بەرێز بارزانی ئاگاداریت ئەمڕۆ لە ئەمریکا چی روویداوە؟ وەڵامی من ئەوە بوو: نەخێر، من سەرقاڵم بە کارەکەمەوە. ئەو گوتی: خۆت بگەیەنە شوێنێك کە بتوانیت سەیری کەناڵی سی ئێن ئێنی ئەمریکی بکەیت. هێندەی گوت و بە خێرایی رۆیشت بۆ سەر کارەکەی.

منیش خێرا خۆم گەیاندە کۆگاکانی کۆمپانیای ساتۆرن و لەوێ رووداوەکەم بینی، ئەمریکا روبەڕوی گەورەترین هێرش بۆتەوە لە کەنارەکانی خۆرهەڵاتی خۆیدا و سەنتەری بازرگانیی جیهان هەرەسی هێناوە لە ئەنجامی هێرشی چەند فڕۆکەیەکی مەدەنی بە شێوەی خۆکوژی. ئەم هێرشەش بۆتە هۆی کوژرانی هەزاران کەس لە چەندین رەگەزنامەی جیاواز، هەروەها پنتاگۆنیش هێرشێکی هاوشێوەی کراوەتە سەر بەڵام زیانەکانی کەم بوون. بێگومان ئەم هێرشە بێرڵ هاربێری دێنایەوە یادی ئەمریکیەکان کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهاندا روویدا.

کاردانەوەکانی سەرۆکی ئەمریکا چاوەڕوانکراو بون. ئەو خەڵکی تەکساسە، بۆیە یەکسەر شەڕی دژی تیرۆری راگەیاند. ئەفغانستانیش ئامانجی یەکەمی ئەو جەنگە بوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەنجامدەرانی ئەو هێرشە و پیلاندارێژەرانیشی هەر لەوێندەر بوون. واتە ئەلقاعیدە. بۆ زانیاریش هەر لە کتێبی (کۆسپەکانی بەردەم رێگەچارەی دیموکراسی) ئاماژەم بەوە کردوە کە عیراق دوای ئەفغانستان ئامانجی دووەمی ئەمریکا دەبێت.

ساڵی ٢٠٠٣ شەڕ دژی سەدام بە مەبەستی روخاندنی هەڵگیرسێنرا. بێگومان سەدام یەکێك بوو لە دڕندەترین رژێمە دیکتاتۆریەکانی سەدەی بیستەم.

ئەمریکیەکان لە ماوەیەکی پێوانەیی کەمدا توانییان سەرکەوتنی سەربازیی گەورە بەدەست بێنن و داگیر کردنی عیراق ماوەی چەند هەفتەیەکی خایاند.

ئەوەی ئەمریکیەکان کردیان، بە هۆی پێشکەوتنیان لەبواری تەکنۆلۆژیا و پلانی سەربازیدا بوو. ئەوەش ئەو پلانەمان دێنێتەوە یاد کە هیتلەر دایڕشتبوو بۆ داگیر کردنی یەکێتی سۆڤێت، کە وای دەخواست هێزە ئەڵمانییەکان هێرشێکی کتوپڕ لە رێگەی تانك و زرێپۆشەوە بە پشتیوانیی هێزە ئاسمانییەکان ئەنجام بدەن بە مەبەستی گەیشتن بە مۆسکۆ. ئینجا دوای ئەوە هێزە ئەڵمانیەکان خۆیان تەرخان بکەن بۆ لەناوبردنی ئەو هێزانەی لە شوێنەکانی تر بەرەنگاری دەکەن. بەڵام ژەنراڵەکانی ئەڵمان لەو جۆرە پلانە تێنەدەگەیشتن. کەچی پیلانی ئەمریکا لەو بارەوە سەرکەوتوتر بوو.

به راشکاوی دەیڵێم روخاندنی سەدام و ئامادەبوونی هاوپەیمانان و لە سەرووی هەموویشیانەوە ئەمریکا و باسکردن لە بنیاتنانی عێراقێکی دیموکراتی کە ببێتە نمونە و پێشەنگ بۆ وڵاتانی دراوسێ، هەموو ئەمانە هیوابەخش بوون بۆ ئاییندەیەکی گەش کە دەبێت گەشتر بێت. هەموو ئەو روداوانە پاڵیان بە مرۆڤەوە دەنا هەوڵ بدات بەشێك بێت لەو وەرچەرخانە پۆزەتیڤە.

دوای ئەوە باسی ئەو هەڵانە کرا کە سەرۆکی ئەمریکی جۆرج بۆش ئەنجامی دان و تائێستاش ئەمریکییەکان هەر ئەنجامی دەدەن. هەموو ئەو هەڵانە رێگر بوون لەبەردەم ئەوەی سەرکەوتنی سەربازی بێتە سەرکەوتنێکی سیاسی کە ئەمە خۆی لە خۆیدا شتێکی گرنگ بوو. سەبارەت بە خۆم، هەر لە سەرەتاوە تێبینیی ئەوەم کردبوو کە نەدەبوو سەرۆك بە ئاشکرا باسی تەوەری شەڕانگێزی بکات و هەندێك قسەی تریش بکات کە بە هۆیەوە مەیدانی جەنگەکەی فراوانتر کردو ترسێکی گەورەی خستە دڵی دراوسێکانی عێراقەوە کە هەموویان وا هەستیان دەکرد دوای عێراق سەرەی ئەوان دێت، بەتایبەتیش سوریا و ئێران.

بە بڕوای من دەبوو ئیدارەی ئەمریکا بزانێت ئەو سیاسەتەی پەیڕەوی دەکات دەبێتە هۆی دروستبونی بەرەیەك و هاوپەیمانێتیەکی شاراوە لە نێوان رژێمەکان و هەندێك لایەنی تردا بۆ ئەوەی پلانەکەی شکست پێ بێنن. ئایا ئەمریکا هەر بە راستی مەبەستی بوو ئەو رژێمانە بڕوخێنێت کە ستەم و دیکتاتۆریەتیان بە میرات بۆ ماوەتەوە، هەر لە سەردەمی مەعاویەوە تا ئەمڕۆ، یاخود لە ژێرەوەو پیلانی تر هەبووە.

بۆیە بینیمان هەر کە سەرکەوتنی سەربازی بەدی هات، لە چەندین لاوە بەرەی دژ بە ئەمریکا دروستبوو و ئەندامەکانی کەوتنە هاوکاریی یەکتر و ناکۆکیەکانی خۆیان وەلانا بۆ ئەوەی دژ بە هێزەکانی هاوپەیمانان و عێراقی نوێ رابوەستنەوەو هەوڵ بدەن عێراقی کۆن بێننەوە مەیدان. لێرەدا ئەوەی سەیر بوو هەڵوێستی ئەڵمانیا بوو کە هاوکاریی ئەم لایەنەی دەکرد، بەتایبەتی لە رووی میدیاییەوە. دوای ئەڵمانیاش فەرەنسا هەمان رێچکەی گرتە بەر. لە

راستیدا کە هەندێك رۆژنامەی ئەڵمانیم دەخوێندەوە هەستم دەکرد ئاماژەی تێدایە بۆ هەندێك لایەن بۆ ئەوەی کار بکەن لەسەر تێکدانی هەوڵەکانی ئەمریکا. ئەم هەوڵانەش بوونە هۆی ئەوەی عێراق ببێتە گۆڕەپانی جەنگ لە نێوان تیرۆریستان و هێزەکانی هاوپەیمانان و هەر لایەنێکیش مەبەستێکی دیاریکراوی هەبوو، بەڵام خاڵی هاوبەشی نێوان هەموویان ئەوە بوو کە پلانەکانی ئەمریکا شکست پێ بێنن، واتە شکستهێنانی ئەزموونی دیموکراسی لە عێراق. ئەو لایەنانەش بریتی بوون لە ئەلقاعیدە و سوریا و ئێران و تەنانەت تورکیاش کە هەمیشە هەڕەشەی دەستێوەردانی سەربازیی لە عێراق دەکرد ئەگەر داواکارییەکانی لە رووی سیاسی و ئابوورییەوە جێبەجێ نەکرێن. لە راستیدا ئەو جەنگە جەنگی بەوەکالەت بوو لە نێوان چەندین لایەندا کە هەمویان عێراقیان کردۆتە گۆڕەپانێك بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکانی خۆیان.

من یەقینم هەیە کە ئەگەر پێشهاتەکانی ١١ی سیپتمبەر نەبوایە، ئەمریکا نەیدەزانی دنیا چەندەها گەلی مافخوراوی تێدایە و ئەم دنیایە تەنها بریتی نیە لەو چەند وڵاتەی کە هەن، هەروەها بیری لە روخاندنی سەدامیش نەدەکردەوە. ئەگەر هێرشەکانی ١١ی سپتەمبەر نەبونایە، ئەوا ناکۆکییەکانی نێو کورد و دواکەوتویی سەرکردایەتیی کورد خۆی لە خۆیدا بەس بوو بۆ ئەوەی ئەمریکا سەدام بگێڕێتەوە بۆ دەسەڵات. لە راستیدا هەر بە تەنها بانگهێشت کردنی هێزەکانی سەددام بۆ هەولێر لە ساڵی ١٩٩٦ لە لایەن مەسعود بارزانییەوە، خۆی لە خۆیدا بەس بوو بۆ ئەوەی ئەمریکا بیر لەوە بکاتەوە کە دەستبەرداری کورد بێت و رێگا بدا سەددام بگەڕێتەوە بۆ کوردستان.

## گەڕانەوە بۆ نیشتمان

بەرمەبنای ئەو پێشهاتە نوێیانەی باسمان کردن و وێڕای ئەوەی خێزانەکەم بە پێویستیان دەزانی بگەڕێینەوە بۆ کوردستان لەبەر چەند هۆیەکی پەیوەست بە داب و نەریتەوە، هەرچەند بە دوورم نەدەزانی هەندێك لایەنیش هانیان دابن بۆ گەڕانەوە، لە تەموزی ساڵی ٢٠٠٥ بڕیارمان دا بگەڕێینەوە. ئینجا لەبەر ئەوەی بە درێژایی ژیانم هەر خەریکی خوێندن و کارکردن بووم، هەندێك جاریش هەردوکیانم پێکەوە دەکرد، لەبەر ئەوە دەبوو دیسان بە شوێن کارێکدا بگەڕێم، ئەوە بوو لە زانکۆی سلێمانی دەستم کەوت، هەرچەند هەموو زانکۆکانی هەرێم پێویستیان بە کادیری زانستی هەبوو.

لە ڕاستیدا لەسەر داوای عەبدولسەلامی برام داوام پێشکەش بە زانکۆی دهۆکیش کرد، هەرچەندە هەردوکمان دەمانزانی وەڵامەکەی نەخێر دەبێت. سەرۆکی زانکۆ پێی گوتم لێرە ئیشێکی باشت دەست ناکەوێت و موچەکەشت باش نابێت، لە موچەیەك بەولاوە هیچی ترت دەست ناکەوێ، ئەویش کرێ خانوو دەیبات، بەڵام ئەگەر ساڵەکانی خزمەتت بۆ حساب بکەم، لەوانەیە دو سەد دۆلار لە موچەکەت بمێنێتەوە، لەبەر ئەوە پێم باشە هەر لە بارزان بگەڕێیت بە شوێن ئیشدا، ئەوەیان زۆر باشترە بۆت. من باوەڕی تەواوم هەیە بەوەی ئەو وەڵامە وەڵامی فەرمیی پارتی بوو. لە سایەی هەبوونی دوو حکومەتدا، واتە ناتوانم ئیشێك لەولا پەیدا بکەم مەگەر بچم لە سەرکردایەتیی حزب بپاڕێمەوە ، بەڵکو هەندێك بەرماوەی زیادەی خوانەکەیانم بدەنێ.

بەڵام هەر کە بیستیان لە زانکۆی سلێمانی کارم دەست کەوتوە ئیدی سیاسەتی تێڵاو گوێزەریان بەکار هێنا. هەڕەشەیان لێ دەکردم، کە هەڕەشەکە سەری نەدەگرت ئینجا بەڵێنیان پێدەدام. جارێکیان شێخ سلێمانیان کردبوە نێوەندگیر بۆ ئەوەی ڕازیم بکات و ئەو بەڵێنانەیان پێدەدام: لەوانەیە بتکەینە وەزیری پەروەردە یان وەزیری خوێندنی باڵا، یان سەرۆکی زانکۆ، ماڵێکی دوو

نهۆم، ئۆتۆمۆبیل و شۆفێر، یان بێ شۆفێر بە ئارەزووی خۆت، پارە گرفت نیە بە مەرجێك بەڵێن بدەیت نەچیتە ناو سیاسەتەوە.

وەلامەکەی من ئەم خاڵانەی لە خۆ گرتبوو:

١-پێش گەڕانەوەم عەبدولسەلامی برام پەیوەندیی بە مەسعودەوە کردبوو. سەبارەت بە گەڕانەوەی من پرسیاری لێ کردبوو، ئەویش گوتبووی پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی لە بارزان نە سەردانی کەس بکات و نە کەسیش سەردانی بکات یان نا.

من گلەییم لە عەبدولسەلام کرد سەبارەت بەوەی قسەی لەگەڵ مەسعود کردوە بێ ئەوەی رای من وەربگرێت، چونکە بڕیاری گەڕانەوە من دەیدەم نەك مەسعود، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێم گوت: دەبوو لێت بپرسیایە ئایا بۆی هەیە قسە لەگەڵ سمۆرەو باڵندە بکات.

لێرەدا ئەو پێشنیارەی مەسعودم بۆ باس کردن و پێم گوتن ئەو پێشنیارە بە کوێی ئەو بەڵێنانەی ئێستاتان دەخوات.

٢-سەبارەت بەوەی ئوتومبیلم دەدەنێ، پێم گوتن ئیدریس ساڵی ١٩٧٤ ئەو بەڵێنەی پێ داوم و تا ئێستاش بەجێی نەگەیاندوە. خۆ ئەگەر مەبەستیان ئەو ئۆتۆمۆبێلەیە ئەوە ئێستا کۆن بوەو بەکەڵك نەماوە.

٣-ئەو ئاسانکاریانە لە راستیدا بۆ من هیچ مانایەك ناگەیەنن، ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەوەیە ئیعتیباری خۆم بۆ بگێڕنەوەو داوای لێبوردنم لێ بکەن، ئەوەشیان ساڵی ١٩٧٧ ئیدریس بەڵێنی پێدام، وێڕای ئەوەش بەڵێنی دا ئەوانەی دەستدرێژییان کردە سەرم سزا بدرێن. ئینجا دوای ئەوەش قەرەبووی ئەو زیانانەم بۆ بکەنەوە کە بەو هۆیەوە لێم کەوتون. دەبێت لەسەر بڕێك پارە رێك بکەوین.

٤-ئەگەر ئەو مەرجانە جێبەجێ کران ئەوە دەتوانرێت هاوکاری لە نێوان هەردولادا دروست بێت بەڵام گەڕانەوە بۆ پەیوەندیەکانی پێشوو، ئەوەیان وەهم و خەیاڵە و هەرگیز روو نادات.

سەرنجم دا نێچیرڤان لە سەرەتادا ئامادەیی خۆی دەربڕیبوو بۆ ئەوەی دیدارێکم لەگەڵ بکات لە هەر کات و شوێنێك بێت، بەڵام ئەویش دواتر پاشگەز بویەوە. دواجار بۆم دەرکەوت کە مەبەست لەم هەموو پێچ و پەنایە ئەوەیە کارەکەی سلێمانیم لە دەست دەربێنن و متمانەم لەوێش لەق بکەن و دوای ئەوەش ئینجا لە بەڵێنەکانیان پاشگەز ببنەوە، وەك چۆن لە رابوردودا کردوویانە.

## سلێمانی: چەند ساڵێکی پێویست

سلێمانی لە مێژە ئاشنایە بە بارزانییەکان، نەك وەك زانیاریی جیۆگرافی، بەڵکوو لەبەر ئەوەی لە چلەکانی سەدەی رابوردودا شێخ ئەحمەد بارزانی بۆ ئەو شارە دورخرابۆوە گەلێك خزم و کەسوکاریشی لەگەڵدا بوو. باوکی منیش یەکێك بوو لەوانە. ئەوەی سەیرە ئەو شوێنەی ئێستا من تێیدا دەژیم تەنیا چەند مەترێك دورە لەو شوێنەی باوکم لە چلەکانی سەدەی رابوردو تێیدا ژیاوە. سلێمانی شارێکی جیاوازە بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تری کوردستان، وەك هەولێرو دهۆك و کەرکوك نیە، ئەوەش بە هۆی ئەو پاشخانە مێژوییەی هەیەتی و هەر لە سەردەمی میرنشینی بابانەوە تا ئەمڕۆیش وابەستەی بیری ئازادیخوازی نەتەوەیی کورد بووە. ئەو شارە پایتەختی بابانەکان و مەلیکی کوردستان (شێخ مەحمود) بووە دوای جەنگی یەکەمی جیهان. بەڵام پێش هەموو ئەو شتانە. ئەم شارە ئێستا شاری رۆشنبیریی کوردستانەو هیچ شوێنێکی تر ناتوانێت شان لە شانی بدات لەو بوارەدا، بەتایبەتی پاش ئەوەی سیاسەتی بە تورك کردن زیانێکی گەورەی گەیاند بە کوردستانی تورکیا. ئەم شارە شاری شاعیرو نوسەرو مێژونوسانە، ئەوانەی کە پێگەی تایبەتی خۆیان هەیەو هەموو کوردێك مافی خۆیەتی شانازییان پێوە بکات.

هەروەها ئەم شارە لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی رابوردودا یەکەم زانکۆی کوردستانی لە ئامێز گرت. بەم شێوەیە ئەو زانکۆیە سەرمەشقی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیریی خەڵکی شارەکە بوە، هەرچەند سەدام دواتر گواستیەوە بۆ

هەولێر، ئەویش لە سۆنگەی پاڵنەری سیاسییەوە. ئەو شارە تەنانەت بێبەش کراوە لە خەستەخانەی تەرزی نوێ (خەستەخانەی سەدام) کە لە هەموو شارەکانی تردا کرابۆوەو تەنانەت لە هەولێرو دهۆکیش، ئەوەش وەك سزایەك بۆ شارەکە لەسەر ئەو هەڵوێستە نیشتمانیانەی هەیبوە. ئیدی سەیر نیە ئەگەر بزانین خوێنەرانی گۆڤارو رۆژنامەکان لە سلێمانی زیاترن لە خوێنەرانی هەردوو شاری هەولێرو دهۆك پێکەوە. ئەم قسەیەشمان پاڵپشتە بەو زانیاریانەی لە کتێبخانەکان وەرمانگرتوە لە سلێمانی.

سلێمانی لە ژێر هەژموونی یەکێتی نیشتمانیی کوردستاندایە، بەڵام گۆڕانیش لە ئێستادا رۆڵی خۆی هەیە. هەردوکیان لە لایەن هەواداریانەوە پشتیوانییان لێ دەکرێت بە تایبەتی لە لایەن رۆشنبیرانی شارەوە. هەروەك سەرکردایەتیی هەردوو حزبەکە لە کەسانی رۆشنبیرو هەلگرانی بڕوانامەی باڵا پێکدێن. ئەم دیاردەیە هەر لە یەکەم لەتبونی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە لەساڵی ١٩٦٤ دەردەکەوێت.

بە کورتی خەڵکی سلێمانی لە شارەکانی تر کراوەترن بە ڕوی گۆڕەپانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریدا، هەر ئەوەش بوە هەندێك جار وامان لێ دەکا بڵێین سلێمانی نزیکترین خاڵە لە ئەوروپای دیموکراتییەوە لە هەموو عێراقدا. بەتایبەتی لە ڕوی هۆشیاریی سیاسیی دیموکراسی و کرانەوەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە.

بەڕاشکاوی دەیڵێم ژیانم لە سلێمانی لەو ژینگە کراوەیەدا بوارێکی باشتری بۆ رەخساندم بە بەراورد لەگەڵ هەولێر و دهۆك. بەڵام لە سەرەتادا زۆر جار خۆم دەبوارد لەوەی تێکەڵ بە بوارە سیاسیەکان ببم، بەڵکو بە پلەی یەکەم بایەخم بە کاروباری خوێندن و وانە وتنەوەو کاروباری تایبەتی خۆم دەدا، بەڵام ئەوەش رێگر نەبوو لەوەی چاوپێکەوتنێك بکەم لەگەڵ گۆڤاری راستەڕێ و لەوێدا ئاماژەم بەوە دا کە پێویستە هەردو حزب خەڵك فێری ژیان و پەیڕەوکردنی دیموکراسی بکەن و نابێت رێگە بدەن جارێکی تر بەغدا لە هیچ بوارێکدا پێشمان بکەوێتەوە. بەڵام روداوەکانی دواتر پێچەوانەی رایەکەی منیان سەلماند.

بەغدا توانی هەنگاوی باشتر بنێت و لە پرسی دیموکراسیدا پێش کوردستان کەوت، چونکە چەند هەڵبژاردنێکی کردوە، دەستوری داناوەو لیژنەی دەستپاکیی هەیە، هەروەك چۆن گفتوگۆکانی ناو پەرلەمان رەهەندێکی دیموکراتیی زیاترمان لە چاو هەولێر پیشان دەدەن. بەڵام هیوادارین دوای هەڵبژاردن لە هەولێریش ئۆپۆزیسیۆنێکی کارامان هەبێت و بتوانێت نەریتەکانی دیموکراسیەت لە هەرێم بچەسپێنێت.

هەنگاوی دوەمیشم کە وەك رێخۆشکردنێك بوو بۆ بەشداریکردنی زیاتر لە گۆرەپانی سیاسیدا، بریتی بوو لە چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ گۆڤاری لڤین و ئەویش گێرانەوەی مێژوویەکی نزیك بوو، لەوێدا هەندێك لایەنی روداوەکانی ساڵی ١٩٧٤–١٩٧٥مان باسکرد. ئەو دیدارە دەنگێکی باشی دایەوەو بەتایبەتی لای مێژوونوسان و ئەوانەی بایەخ بە مێژووی هاوچەرخی کورد دەدەن.

## هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩

یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمان لە کوردستان لەساڵی ١٩٩٢ بەرێوە چوو. لەو کاتەوە سیستمێك لە کوردستان داهێنرا کە پێی دەوترا سیستمی پەنجا بە پەنجا لە نێوان هەردو حزبە گەورەکەی کوردستان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان.

بە هۆی بێمتمانەیی نێوان هەردوو حزبەوە ناچار بوون هەر وەزیرێك جێگرێکی بۆ دابنێن کە سەر بە حزبی بەرامبەر بێت. ئەوەش بوە هۆی ئیفلیج کردنی حکومەت لە زۆر بواردا. ئەو بێ متمانەییە زادەی شەرێکی ناوخۆی درێژخایەن بوو کە تێیدا هەردوو حزب بەردەوام پیلانیان دژی یەکتر گێراوە، ئەو نەریتەش لە هەموو شۆرشەکانی کوردەوە هاتوەو نەوە بۆ نەوە گواستراوەتەوە. سەرۆکایەتیی پەرلەمان درا بە پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکایەتیی وەزیرانیش پشکی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بوو، هەر بەخێراییش گەندەڵیی ئیداری تەشەنەی سەندو هەرچی ئامێری گرانبەهاو بە

نرخە بە هەرزانترین نرخ فرۆشران، تەنانەت شوشەی پەنجەرەی قوتابخانەکانیش دەرهێنران و فرۆشران.

لە جیهانی ئیسلامیدا ساختەکاری و گەندەڵکاری شتێکن دەسەڵاتداران شەرمی لێ ناکەن، بەڵکو بۆتە بەشێك لە ژیانی سیاسییان. ئەوەی سەیرە هەندێك سیاسەتمەداری کورد شانازیشی پێوە دەکەن. لە وڵاتانی گەندەڵ هەڵبژاردن شانۆگەریەکە بۆ خەڵەتاندنی جەماوەر.

ساڵی ٢٠٠٩ هەڵبژاردنی تازە کرا. ئەم هەڵبژاردنە شتێکی ناچاری بوو وەك هەر هەڵبژاردنێکی تر چونکە هەڵبژاردنەکانی عیراق کە پێش هەڵبژاردنەکانی هەرێم کرابوون هیچ بوارێکیان بۆ سەرکردەکانی کورد نەهێشتبۆوە. بەو شێوەیە وا دەرکەوت کە دیسان هەرێم بەدوای بەغدادا رادەکات لە بری ئەوەی ئەم ببێتە نمونەیەك بۆ ئەو.

تەنانەت کۆنگرەی حزبەکانیش بە دە ساڵ و زیاتر، جارێك نابەسترێن. خۆ ئەگەر هەڵبژاردنێك بە رێکەوت کرا، جا بۆ پەرلەمان بێت یان کۆنگرەی حزب بێت، ئەوە هێند فشار دەکرێت بۆ ئەوەی ئەنجامەکان بە دڵی خۆیان بێت. ئەو ئەنجامە دەبێتە شتێکی گرنگ بۆ سەرکردایەتی حزب و ئیدی شانازی پێوە دەکات. سەبارەت بەوەی دەبێت هەڵبژاردنی پەرلەمانی لە کاتی خۆیدا بکرێت، ئەوەیان شتێکە کە بیری لێ ناکرێتەوە. بەو شێوەیە شەرعیەتی هەتا هەتایی بۆ سەرکردایەتی دروست دەکرێت، دوای ئەوەش پرۆسەی بە میراتیگرتن لە ئاییندەدا رودەدات. بێگومان هەر حزبێك لە ناوخۆیدا رێگە بە ئۆپۆزیسیۆن نەدات لە ناو پەرلەمانیش رێگەی پێنادات، هەر کات گەیشتە دەسەڵات.

لە کوردستان دیاریکردنی کاتێکی دیاریکراو بۆ سەرکردایەتی کردن، کە دوای ئەوە ئیتر دەبێت ئەو کەسە بڕوات، تەنیا وەهمێکە، بەڵکو کاری سیاسی هەموی لەسەر ئەوە بنیاتنراوە کە ئەو کەسە لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە ئیدی قوربانیدان بۆ ئەو مانەوەیە چەند بێت، گرنگ نیە. بەڵکوو دوای خۆیشی دەسەڵات بە میرات بۆ نەوەکانی خۆی بەجێ دێڵێت.

بەشداریکردنی ئێمە لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩/٧/٢٥ بۆ راستکردنەوەی ئەو لارییانە بوو کە لە هەرێمدا هەیە. بەناوی بزوتنەوەی چاکسازی کوردستانیەوە، لیستی ٥٦، جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێت ئۆپۆزیسیۆنێکی پەرلەمانی وەك هەنگاوی یەکەم دروست بێت. بە ناوی دروستکردنی ئەو ئۆپۆزیسیۆنەشەوە خۆمان هەڵبژارد لە لیستێکی سەربەخۆدا، بێگومان لایەنەکانی تریشمان بیر نەچوو بوو و هەوڵماندا کەلێنەکان پڕ بکەینەوە، و تێزی تازەمان هەبێت.

هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوان بووین رێگری زۆر لە بەردەمماندا قوت بێتەوە، بەڵام وردە وردە کۆسپی وا هاتنە رێمان کە ئێمە چاوەڕێیان نەبووین، ئەو داهێنانە خراپانەی مەسعود یەکەمجار بوو بەکار بهێنرێت و بە ئاشکرا لە بەردەمی رای گشتیدا ئەنجام بدرێت، هەرچەند لە رابردودا بە نهێنی بەڕێوە دەبرا. ئەو رێگریانەش ئەمانە بوون:

١-چاوەڕێ بووین لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان ناخۆشی دروست ببێ، بەتایبەتی لە لایەن مەسعودەوە، چونکە من ئەزموونی رابوردوم لەگەڵیدا هەیە.

٢-لە هەڵبژاردنی دیموکراتیدا دەبێت جۆرێك لە هاوسەنگی لە نێوان راگەیاندن و توانای ماددیدا هەبێت بەڵام لەبەر ئەوەی حزبە سیاسیەکان، ئەوانەی بۆ ماوەیەکی درێژ لە ناوچەکانی ژێر دەستی خۆیان دەسەڵاتیان پەیڕەو کردبوو، یان لە چوارچێوەی هاوپەیمانێتیەکی حکومیدا بوون، ئەو حزبانە بە ئارەزووی خۆیان بێ ئەوەی کەس لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکات، لە خەزێنەی حزب و هەرێم پارەیان دەکێشایەوە. ئەم پارەیە لە سەرەتاوە بە کەمی دەستی پێکرد، دواجار بە هێواشی هەڵکشاو بووە بڕی زۆر خەیاڵی. ئەوان توانییان میلیشیاکانی خۆیان پیتاك بکەن، ئەو میلیشیایانەی تەنیا بە قسەی حزبەکەی خۆیان دەکرد، و سوپایەکی زەبەلاحی میدیاکاریان لە رێگەی دەرکردنی رۆژنامەو گۆڤارو دامەزراندنی ئێستگەی رادیۆو تەلەفزیۆنەوە دروست کردبوو، لێرەدا باس لە بڕی چل ملیۆن دۆلاری مانگانە دەکەین، کە هەردو

حزب مانگانه دەستیان دەکەوت و حزبە بچوکەکانیش بڕێکی کەمتریان بەردەکەوت کە نزیك بوو لە نیو ملیۆن دۆلار.

لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ گۆڤاری لڤین ژمارە ۱۰۷ نێچیرڤان باسی هەڵبژاردنی کردو هەروەها باسی ئەو برە پارەیەشی کردوە کە هەمیشە حزبەکان ویستویانە بیشارنەوە یان بڵێن ئەو پارەیە لەوە کەمترە کە باس دەکرێت. گوتی: لە هەڵبژاردنەکانی ئەمساڵ جەماوەر پەیامێکیان پێ ڕاگەیاندین، گوتیان ئێمە گلەییمان هەیە، لە پەیامێکی تریشدا گوتیان: ئەگەر خۆتان چاك بکەن، ئێمە دەنگتان دەدەینێ.

لێرەدا دەبێت هەڵوەستەیەك بکەین لە بەردەم هەندێك چەمکدا. جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەوەی خەڵك دەنگی خۆیانت بدەنێ یان لە ڕێگەی هەڕەشەو سوکایەتی پێکردنەوە دەنگەکانیان بدزیت. لە ناوچەی بارزان ئەوە روویدا. حزب ئازادیی خەڵکی بە تەواوەتی زەوت کرد بۆ ئەوەی شەرم لە خۆی بکات. لەگەڵ هەر کەسێکی دەنگدەردا، دەبوو چەند کەسێکی خۆیانی لەگەڵ دابێت (لە یەك کەسەوە بۆ حەوت کەس). ئەوان بە شوێن دەنگدەرەوە دەبون و ناچاریان دەکرد دەنگ بدات بە لیستێکی دیاریکراو. دەڵێم حەوت کەس چونکە یەکێك لە بارزان سوێندی خوارد کە حەوت کەس لەگەڵیدا بون و پێیان وتووە دەبێت دەنگ بدەیت بەو لیستەی نێچیرڤان ئاماژەی پێ دەکات!

ئەمە وێڕای کردنەوەی سندوقەکانی دەنگدان لە زۆربەی شوێنەکان تاکوو رێ بگرن لە دەرچوونی لیستێکی دیاریکراو وەك لیستی چاکسازیی کوردستانی دکتۆر عەبدولموسەوەر.

ئەوە بێجگە لە چەندین پێشیلکاریی تر وەك درێژ کردنەوەی ماوەی دەنگدان بۆ ئەوەی سود ببینن لەو دەنگانەی تا ئەو ساتە نەچوون بۆ دەنگدان وەك ناڕەزایی دەربڕینێك.

ئایا ئەمە ئەو شتەیە کە بەڕێز نێچیرڤان ناوی دەنێت دەنگدان؟

یان دەنگدان بەهۆی ئەوەوە بوە کە هەڕەشەیان لە خەڵك کردوە بەوەی دەریدەکەن و لە کارەکەی دوری دەخەنەوە. ئەم هەڕەشانەش بە شێوەیەکی

نایاسایی بەسەر ١٨٠٠ کەسدا دابڕاوە بۆ ئەوەی خەڵك چاوترسێن بکەن و لە ڕێگەی برسیکردنی منداڵەکانیەوە بترسێنرێن بۆ ئەوەی دەنگ بدەن بە لیستێکی دیاریکراو.

بەڕێز نێچیرڤان گوتی: ئەوەی ئێستا بە زۆری قسەی لەسەر دەکرێت بریتیە لە بودجەی یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستان، هەندێك دەڵێن ٣٥ ملیۆن یان ٤٠ ملیۆنە، چونکە بەشێك لەم پارەیە دەچێت بۆ پێشمەرگەو هێزە یەکگرتوەکانی ئاسایش. بەڕای من دەبوو یەکێتی و پارتی هەر وەك حزبەکانی تری ناو پەرلەمان پارەیان وەربگرتبایە و بودجەیەکی تایبەت بە خۆیان هەبوایە.

لە خوێندنەوەی ئەم دێڕانەوە چەند ڕاستییەکمان بۆ دەردەکەوێت:

لە ڕاستیدا لە کوردستاندا حکومەتێکی یەکگرتوومان نیە، هەرچەند ١٩ ساڵ بەسەریدا تێپەڕیوە، بەڵکوو دوو دەزگای هەواڵگری و دوو دەزگای میدیایی و دوو هێزی چەکدارو... هتد هەیە.

ئەم واقیعە هەندێك شتی تر دەخوازێت وەك ئەوەی دەبێت سەرچاوەیەکی دارایی هەبێت بۆ ئەوەی ئەم پەرتبوونە بەردەوام بێت و هەر هەوڵێك بۆ یەکگرتنەوە ئەستەم بێت و هەر هەڵبژاردنێکی داهاتوش لەوانەیە ببێتە هۆی بچووککردنەوەی یەکێك لەو دو حزبە یان هەردوکیان بەشێوەیەك کە ئیتر هیچ بەهایەکیان نەمێنێت.

وابەستەبوونی هێزەکانی پێشمەرگەو دەزگاکانی ئاسایش بە حکومەتەوە دور لە هەژموونی حزبی و بە دەستکەوتنی سەرچاوەی بژێویان لە لایەنێکی نا حزبییەوە مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ مسۆگەر کردنی سەربەخۆیی ئەو دەزگایانە لە کاتی بڕیارداندا نەك بە ئارەزووی سەرکردەی حزبەکان بێت. بەم شێوەیە حزبەکان پایەیەکی گرنگی خۆ سەپاندن بەسەر خەڵکدا لە دەست دەدەن.

ئەگەر شتێکی وا روبدات چیتر کەسێکی وەك مەسعود ناتوانێت فەرمان دەربکات بۆ کوشتنی کەسێکی وەك دکتۆر عەبدولموسەور چونکە ئەگەر ئەو لایەنانە سەربەخۆ بن پێش هەمو شتێك داوای پاساوی یاسایی دەکەن، ئەگەر نا ئەوە فەرمانی وا جێبەجێ ناکەن.

# هەڵبژاردنەکان و دەزگای میدیایی و دەزگای تیرۆری سەردەمیانە

با بگەڕێینەوە بۆ گرفتەکان و باسی ئەوە بکەین کە هەر کەسێك لە بارەی مێژووی میدیاوە شت بخوێنێتەوە دەزانێت ئەو دەزگایە چ رۆڵێکی گرنگ و یەکلاکەرەوەی هەیە لە هەڵبژاردنەکاندا، پێش هەموشیان تەلەفزیۆن. ئەوانەی دەستیان گرتوە بەسەر ئەو کەنالانەدا دەرفەتی سەرکەوتنی زیاتریان هەیە. رۆڵی ئەو دەزگایانەش بۆ یەکەمجار لە پێشبڕکێی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکادا دەرکەوت کە لە نێوان جۆن کیندی و ریتشارد نیکسۆن بوو. ئەو کاتە کاریگەریی راگەیاندن بە تەواوەتی دەرکەوت و دەریخست کە لە ئاییندەدا ئەو دەزگایە چ رۆڵێکی کاریگەر دەبینێت. بێگومان لە ئەمریکا هیچ قۆرخکارییەکی میدیایی نیە لە بەرژەوەندیی لایەنێك دژی لایەنێکی تر، بەپێچەوانەی میدیای کوردیەوە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا ئەمە بێجگە لە هەبوونی چەندین شتی تر کە پشتیوانیی ئەو حزبانە دەکات.

هەژموونی حزبە گەورەکان بەسەر هەموو جومگەکانی دەوڵەتدا: پۆلیس و ئاسایش و میلیشیات و دادوەری و دارایی.. هتد و بەکارهێنانی ئەو دەزگایانە لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا شتێکی شاراوە نیە. دەبوو ئەوەش لەبەرچاو بگیرایە. بێگومان لەوێ ئەو کاریگەریە لە ژێر سایەی سیستمێکی دیموکراتیدایەو ئەو دەزگایانە تیایدا بێلایەنن، چونکە ئەو دەزگایانە لەسەر ئەو بنەمایە دروست کراون کە دەبێت خزمەتی گەل و نیشتیمان بکەن نەك حزبێك و کەسێکی دیاریکراو. هەروەها دەستخستنە کاروباری دادوەری لە لایەن حزبەکانەوە شتێکی شاراوە نیە. سەبارەت بە پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ ئەوەیان رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی پێش هەڵبژاردنەکان نامیلکەیەکی تایبەتی لەسەر دەرکرد لە ژێر ناونیشانی: "هیوا و ترس". هەموو ئەمانە بێگومان رەنگدانەوەن بۆ خراپ بەکارهێنانی ئەو دەزگایانە لە لایەن چەند لایەنێکەوە بۆ مەبەستی تایبەتی.

ئەم فاکتەرە نێگەتیڤە لە ماوەی هەڵمەتی هەڵبژادندا مەترسییەکانی لای زۆر کەس زیاد کردبوو دەیانپرسی: ئەگەر هاوپەیمانێتی دوو حزبی گەورە شکست بێنێت، ئەی هەڵوێستی دەزگا ئەمنیەکان چۆن دەبێت؟ ئایان هێزی چەکداری دژ بە لایەنە براوەکان بەکار ناهێنرێت؟

شاڵاو عەلی عەسکەری بەڕاشکاوی ئەم مەترسیانەی خستە روو کاتێك گوتی: من لە خوا دەپاڕێمەوە کە ئۆپۆزیسیۆن ئەمجارە دەرنەچێت و نەتوانێت زۆرینەی پەرلەمانی بەدەست بێنێت، چونکە ئەوانەی دەزگاکانی حکومەتیان بەدەستە لەوانەیە پەنا بەرنە بەر بەکارهێنانی توندوتیژی لە رێگەی هێزە چەکدارەکانیانەوە کە سەر بە حکومەتن، وا باشترە سەرکەوتنی ئۆپۆزیسیۆن گەورە نەبێت بەڵام دواتر بە هێواشی گەشە بکات.

پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا شتێکی سەیر نیە ئەگەر لای کەسایەتیەکی وا هۆکارەکانی بێئومێدی دروست بێت لە کاتێکدا ئەو باوکی لە هەلومەرجێکی زۆر خراپدا ون بووە.

خراپ بەکارهێنانی دەزگاکانی حکومەت بۆ تۆقاندنی خەڵکە سڤیلەکە بە مەبەستی کاریگەریی خستنە سەر بڕیارەکانیان لە هەڵبژاردندا، لە رواڵەتدا وا دەریدەخات کە هەڵبژاردنێکی دیموکراتییە، بەتایبەتی لەبەردەم کامێراکانی تەلەفزیۆن، بەڵام لە راستیدا ئەوە خراپترین نمونەی خراپ بەکار هێنانی دەسەڵاتەو دورە لەهەر شەرعیەت و یاسایەکەوە.

هەڕەشەی کوشتن و زمانبڕین و فڕێدانە ناو روبارو رێگرتن لە خەڵك تاکو بە ئازادی دەنگ نەدەن لە رێگەی هاندانی ئاسایش لە دژیان. هەڵپچڕاندنی سندوقەکانی دەنگدان بە هاوکاری هەمان ئەو لایەنانە بۆ ساختەکاری لە رێگەی بەکارهێنانی دەنگی ناڕەزایەکانەوە کە نەچوون بۆ هەڵبژاردن. هتد.. هەموو ئەمانە بە هۆی بێدەنگیی ئەو دەزگایانەیە کە ئەرکیان رێگرتنە لە پێشێلکارییەکان.

ئەم شتانە چەکێکی بەهێز بوون و لە لایەن هێزە سیاسیە گەورەکانەوە بەکار دەهێنران، ئەوانەی ناوی دیموکراتییان لە خۆیان ناوە. ئامانجی ئەو

ڕەفتارانە دژایەتی کردنی لیستەکەی ئێمە بوو. ئەوانەی ئەم کارانەیان دەکرد هەر ئەوانە بون کە چەندین ساڵە ئەو ڕێسایە پیادە دەکەن کە دەڵێت (ئێمە ئامادەین هەموو شتێك تێك بدەین ئەگەر کارەکان بە دڵی خۆمان نەبن). هەر بۆیە پێویست بوو سەدام بگەڕێتەوە بۆ هەولێر و هێزەکانی تورکیا بێنە ناو کوردستان کە تائێستاش هەر ماونەتەوە.

هەڕەشەی کوشتن و بڕین و بەکارهێنانی دەزگا سەرکوتکەرەکان دژ بە لیستەکەی ئێمە وەهای کرد ریزی یەکەمی پشتیوانەکانمان لە پرۆسەی هەڵبژاردن بکشێنەوە. دەکرا ئەو کارە زیاتر بەرهەمی هەبوایە ئەگەر چەندین دۆستی نزیکمان هاوکارییان بکردینایە، ئەوانەی ئەو ڕەفتارە نایاساییانەی ئەوانی تریان ریسوا دەکرد. ئێمە لە ناخی دڵمانەوە سوپاسی ئەو دۆستانە دەکەین. بە ڕاستی هەڵوێستەکانی ئەوان پشتێنەیەکی گرنگ بوو بۆ دیموکراسی و هەولێك بوو بۆ بەرهەڵستکردنی خۆسەپاندن و خراپە بەکارهێنانی دەسەلات.

ئێمە توانیمان لیستێك کە پێکهاتبوو لە ١٤ کەس ئامادە بکەین بۆ هەڵبژاردنەکان. ئەوانە ئامادەیی خۆیان دەربڕی بوو لەپێناوی چەسپاندنی بەهاکانی دیموکراسیدا خەبات بکەن وێڕای ئەو هەلومەرجە سەختەو نەبوونی دەرفەتی یەکسان بۆ هەموو کاندیدەکان. ئەم کارەش ئەوە دەردەخات کە ئەم گەلە هێزی گەورەی شاراوەی تێدایە ئەگەر بە جوانی ڕێك بخرێت. هەروەها ئەوەی دەرخست کە بیروباوەڕ دەتوانێت بەرەنگاری ملهوڕی و خۆسەپێنیی دەسەلات بێتەوە. ئەو خەڵکانەش لە ئاییندەدا دەبێت ببنە بناغەیەکی بەهێزو بەرفراوان بۆ دیموکراسیەتێکی ڕاستەقینە، ئەوەش ئەو ئامانجەیە کە دەبێت لەپێناویدا تێ بکۆشین. ئەو روحە لە ڕاستیدا شکستێکی گەورەی بەسەر گەورەترین حزبی هەرێمدا هێنا، هەر لەبەر ئەوەش ناچار بوو بۆ خۆ رزگارکردن پەنا بەرێت بۆ ساختەکاری و بە هەموو شێوەیەك. ئەو حزبە ساختەکاری وەك باشترین ئامرازی سەرکەوتن لە هەڵبژاردن سەیر دەکا.

بەلام زەمان دوو ڕۆژە، ڕۆژێك بۆ تۆیەو ڕۆژێکی تر لە دژی تۆیە، ئێمە مافخوازین و ئەمڕۆ نا، سبەینێ هەر وەریدەگرین.

لە ماوەی هەڵبژاردندا هەمیشە ئەوەم دوبارە دەکردەوە کە پشتیوانیکردن لە لیستەکەی ئێمە پشتیوانیکردنە لە چەسپاندنی دیموکراسیەتێکی راستەقینە، دەمگوت هەر دەنگێك بە ئێمە دەدرێت وەك بزمارێکە دەدرێت لە تابوتی دیکتاتۆریەت و دواکەوتویی و سوکایەتیکردن بە یاساو پێشێلکردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی. لەبەر ئەوە زۆر کەس بەلایانەوە سەیر بوو و دەیانگوت، ئێوە بەو ژمارە کەمەو ئەوان بەو زۆرییەو بەو هەموو هێزو توانایەیانەوە لە راستیدا ململانێیەکی نابەرابەر دەکەن.

## رێ و شوێنەکانی خۆپاراستن

ئێمە دەمانزانی چی رودەدات، بۆیە هەوڵماندا چەند رێوشوێنێك بگرینە بەر بۆ هەر شتێکی نەخوازراو، وێڕای ئەوەی هەمیشە جەختمان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئێمە هەر بە شێوەیەکی ئاشتیانە کارەکانی خۆمان ئەنجام دەدەین، تەنیا قەڵەم و کاغەزمان بەدەستە کە لە هەموو دیموکراسیەتێکدا رێپێدراوە لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا. ئێمە ئەم کارانەمان ئەنجامدا:

١-هەوڵماندا لایەنەکان لەوە ئاگادار بکەینەوە کە ساختەکاری لە هەڵبژاردنەکاندا هەر رودەدات، ئەوەشمان لە رێگەی چەند لایەنێکی پەیوەندیدارەوە پێگەیشتبوو، بۆیە لیستەکەمان هەمیشە پێداگریی لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێت زۆرترین چاودێری بێلایەن بەشدار بن. یەکێك لەو سەرچاوانە لە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان خۆی بوو، ئاماژەی بەوە کرد کە پارتی دەڵێت هەر کەسێك هەڵبژاردن بایکۆت بکات لە راستیدا دەنگەکەی دەدات بە ئێمە چونکە پارتی خۆی لیستەکەی ئەو کەسە پڕ دەکاتەوە.

ئەوە وێڕای ئەوەی کە خۆم بەرێکەوت لە هۆتێل ئاشتیی سلێمانی بە کاك سەعدی گەیشتم، ئەو بە راشکاوی و بێ پێچ و پەنا ئاماژەی بەوە دا کە چاوەڕوانی لیستەکەی ئێمە دەکات گوتی "سوێند دەخۆم بە خوداو بە شەرەف و تەلاقی خۆم، ئێمە بێ دودڵی سەدان سندوق دەگۆڕین و لە ناوی دەبەین تا رێ بگرین لە دەرچوونی ئێوە".

به ڕاستی من لەو باوەڕەدا بوم کە کاك سەعدی لە قسەکاندا زێدەڕۆیی نەکردوە، چونکە ئەو گرفتانەی بەرەو رووی لیستەکەمان بۆوە، رەنگدانەوە ئەو قسانە بوو کە کاك سەعدی باسی کردن، ئێمەش سوپاسی راشکاوییەکەی دەکەین. بێگومان دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە هەڵبژاردنەکانی سلێمانی لەوەی هەولێرو دهۆك پاکتر بوون بەڵام رای گشتی هاوڕایە لەسەر ئەوەی ساختەکاری لە سلێمانی بە شێوەیەکی سنوردارە کە هیچ کاریگەریەك لەسەر ئەنجامەکان نەبوو، بەپێچەوانەی هەولێرو دهۆکەوە. لەوێ ساختەکاریەکان ئەنجامی زۆریان گۆڕی. ناوچەی بارزان هەر زۆر خراپ بوو چونکە لە ساختەکاریدا ئەم ناوچەیە بەراورد بە ناوچەکانی تر ناکرێت.

بارزان لە هەموو ناوچەکانی تر زیاتر ناڵاندویەتی بەتایبەتی لە بواری سیاسیدا. کاتێك کۆمەڵێك خوێندکار ویستیان رێکخراوێکی خوێندکاریی سەربەخۆ پێکبێنن، بەم شێوەیە وەڵامیان درایەوە (چەندین رێکخراوی قوتابیان هەیە سەر بە پارتی دیموکراتن و دەبێت بچنە ریزەکانی ئەو رێکخراوانەوە). کاتێکیش هەندێك کەس پرسیبویان: بەڵام دیموکراسی لە کوێی ئەمەدایە؟ وەڵامیان ئەوە بوە: ناوچەی بارزان حاڵەتێکی تایبەتە.

ئەم ئەقڵیەتە تەنیا لایەنی سیاسی ناگرێتەوە، بەڵکو تێدەپەڕێنێت بۆ کێشە یاساییەکانیش. لە کاتێکدا پێداچوونەوەیان بۆ پرسێکی یاسایی دەکرد، کەسێك گوتبووی: لەم حاڵەتەدا یاسا لە کوێ جێی دەبێتەوە؟ وەڵامەکەی بەم شێوەیە بوو: "من یاسام. هەر شتێك من بیڵێم، دەبێ ئەوە بێ. کە گوتم نابێت ئیتر نابێت".

٢-هەوڵماندا هەندێك سەرچاوەی دارایی دابین بکەین بەڵام بە بەراورد لەگەڵ لایەنەکانی تر بەراورد بکرێت، بەتایبەتی حزبە گەورەکان، شتێکی ئەوتۆمان چنگ نەکەوت. ئەم خاڵە بەلای مەسعودەوە زۆر گرنگ بوو. کە لە بارەی توانای داراییمانەوە پرسیبوی، پێیان وتبوو پێنج سەد هەزاریان تەرخان کردوە، بە پەلە گوتبوی دۆلار، بەڵام وەڵامەکە بۆ ئەو دڵخۆشکەر بوو، وتبویان نەخێر (مانگانە بە دینار). لێرەدا مەسعود گوتبوی: ئەوانیش وەك هەموان ئازادن بەڵام شکست دێنن، چونکە سەرچاوەی دارایی پێویستیان نیە.

٣-ئێمە یەقینمان هەبوو کە مەسعود هەڵوێستی خراپی دەبێت بەرامبەرمان. ئەو هەمیشە بەپێچەوانەی ناوی حزبەکەیەوە هەڵسوکەوت دەکات.

بۆیە دەبوو بە شوێن هاوپەیمانێکدا بگەڕێین کە هەمان بۆچوونی ئێمەی هەبێت. ئەوەشمان بە پلەی یەکەم لە کاك نەوشیرواندا بینیەوە، ئەو پیاوەی بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٧٦ لە نەمسا یەکترمان ناسی و دوای ئەوە یەکترمان نەبینیەوە.

هەر لە یەکەم دیدارمان بە ئامادە بوونی (ب) و (م) یەکسەر چومە ناو بابەتەکە، چونکە دەمزانی سەرقاڵە. لێم پرسی: کاك نەوشیروان ئێمە لە ساڵی ١٩٧٦ یەکتر دەناسین بەڵام تێبینی دەکەم هەڵوێستەکانتان جۆرێك ناڕوونیی تێدایە. هەندێك جار دەڵێن بەڵێ و هەندێك جار دەڵێن نەخێر! کاکە تکا دەکەم بە راشکاوی پێم بڵێ ئایا ئێوە ئەم کارە دەکەن یان نا؟

ئەو لە کاتێکدا سەیری زەویەکەی دەکردو بیری دەکردەوە، سەری هەڵبڕی و گوتی: کاك عەبدولموسەوور ئێمە ئەم کارە دەکەین. من گوتم: کاك نەوشیروان ئێوە دەیکەن بەڵام ئێمە کردمان.

لە راستیدا بەرژەوەندیی هەردولامان و بەرژەوەندیی گشتیش وای دەخواست کە هاوپەیمانییەك بکەین، یان لێك نزیکبوونەوەیەك بێنینە دی کە هەردولامان سودمەند بین لێی، هەر لەوێدا لەسەر چەند شتێك رێککەوتین. من پێم وابوو دەبێت جۆرێك هەماهەنگی هەبێت لە نێوان هەموو ئەو لایەنانەی لیستی نوێیان هەیە. گومانیش لەوەدا نەبوو کە دەبێت ئەو قەوارانە سەربەخۆیی خۆیان و روانگەی فیکریی خۆیان بپارێزن. لە راستیدا هیچ گرفتێکیشمان نەبوو لەوەی کە پێویستە کاك نەوشیروان سەرکردایەتی ئەو هاوپەیمانێتیە بکات، ئەویش لەبەر چەند هۆیەك، لە پێش هەموویانەوە ئەوە بوو کە ئەو دەزگای راگەیاندنی کارای لەبەر دەستە و ئێمەش بە هیوای ئەوە بووین بتوانین کەڵك لەو دەزگایانە وەربگرین. لەسەر ئەوەش رێککەوتین. رێکەوتنەکە وابوو کە لە هەفتەیەکدا کاتژمێرێکمان پێ بەخشن. هەر بە

راستیش له ٢٣ی ئازاری ٢٠٠٩دا چاوپێکەوتنێکی من کرا له لایەن کەریم جولیەوە بە شێوەزاری کرمانجی، بەڵام لەو کاتەدا لەبەر هۆیەك که خۆیشم نازانم چی بوو هەستم کرد که ئەمە دوا دیدارم دەبێت. بۆیە ویستم لەو دیدارەدا زۆرینەی ئەو بۆچونانە باس بکەم کە جێی بایەخی لیستەکەمان بوون.

کاردانەوەی خەڵك بەرامبەر دیدارەکە باش بوو. خۆ ئەگەر بمناتوانیبایە بەو ئاراستە بەردەوام بین، وەك رێکەتبووین، ئەوە نەدەتوانرا بەو شێوەیە ئابلۆقە بدرێین لەو شوێنانەی کە ئاشکرا بوو پشتیوانییان لە ئێمە دەکرد و لەوێشەوە نەیاندەتوانی بە ساختەکاری دەربچن. هەر ئەم هۆیانە پاڵی پێوەناین لەگەڵ کاك نەوشیروان بە ئامادەبوونی (ب) داوای هاوپەیمانێتی بکەین بەو مەرجەی ئەو سەرکردایەتیەکی تەواوی ئەو هاوپەیمانێتیە بکات، بەڵام نەچوە ژێر باری شتێکی لەو شێوەیە.

لە راستیدا هاورێکانم زۆر بەلایانەوە سەیر بوو و توشی شۆك ببون کاتێك هەواڵەکەم پێ گەیاندن. هەموشیان هاودەنگ بون لەسەر ئەوەی هەڵوێستەکەی کاك نەوشیروان هەڵەیە.

هەر بەپێی ئەو هەستەی لە کاتی دیدارەکەدا توشم بوو، ئیدی تاکە دیدارمان بوو لە کەی ئێن ئێن، چیتر نەمانتوانی لە راگەیاندنی کوردیدا چاوپێکەوتنی تر ئەنجام بدەین.

هەلی دوەممان لە رێگەی یارمەتیی گەلی ئەمریکاوە بۆ رەخسا کە بە گوێرەی دابونەریتی دیموکراسی رێگەیان بە هەموو لایەنەکان دەدا رابۆچوونی خۆیان دەربرن، لە کەناڵی نەورۆز توانیمان دیدارێك ساز بکەین. لە راستیدا ئێمە دوا کەس بووین کە بەشداریمان لەو بەرنامە ئەمریکیەدا کرد کە دەیویست دیموکراسیەت لە هەرێم پەرە پێبدات، ئەویش لە رێگەی پێدانی دەرفەتی یەکسان بە هەموو لایەنەکان (چونکە هەندێك کەس هەوڵیاندا لەو هەلە بچوکەش بێبەشمان بکەن) کە مەرجێکی بنەرەتییە لە هەر هەڵبژاردنێکی دیموکراتیدا، وەك ئەوەی لە جیهانی دیموکراتدا کاری پێ کراوە.

بێگومان یەکێك لەو پرسیارانەی زۆر دوبارە دەبونەوە، سەبارەت بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بوو. ئێمەش هەوڵمان دەدا خۆمان لە وەڵامی ئەو پرسیارە لابدەین، چونکە دەمانزانی دیاریکردنی ژمارەی کورسیەکانی پەرلەمان تا رادەیەکی زۆر پشت بە دەرفەتی راگەیاندن دەبەستێت، بۆیە کاتێك رێککەوتین لەسەر ئەوەی کە هەفتەی یەك سەعاتمان لە کەی ئێن ئێن پێ بدەن، لەو باوەڕەدا بووین کە دەتوانین ١٠ کورسی بێنین، بەڵام کاتێك دەرکەوت ئەو رێککەوتنە لەبەر هۆیەکی نەزانراو سەر ناگرێت، هەر لەو باوەڕەدا بووین کە ئێمە ٣ کورسی دێنین، بەڵام ئەو ساختەکارییەی لەو ناوچانەدا کە ناوچەی جەماوەری ئێمەیە روویدا، رێگر بوو لە بەردەم دەنگهێنانی ئێمە.

لەگەڵ کاك نەوشیروان جیاوازیەکی تریشمان هەبوو. ئەو لەوە رازی نەبوو کە جەختمان دەکردە سەر ئۆپۆزیسیۆن بوون لە پەرلەمان چونکە هەندێك جار پێی وابوو ئۆپۆزیسیۆن زۆرینەی دەنگەکان دەچنێتەوە.

بێگومان لە ئاییندەدا دەبێت سود لەم ئەزموونە وەربگرین بەڵام هەر دەبێت پەیوەندیەکانمان پەرە پێ بدەین. لە ڕاستیدا لەگەڵ یەکێتی نیشتمانیش هەڵوێستێکی هاوشێوەمان هەبو، چونکە شێوازی کاری یەکێتی نیشتمانی زۆر دیموکراتییانەیە بە بەراورد لەگەڵ پارتی، بە شێوەیەك ناتوانین بەراوردیان بکەین.

گۆڕان هەر شێوە هاوکارییەکی میدیاییەیان لەگەڵ ئێمە بێ هیچ پاساوێك راگرت. هەندێك قسە هەیە لەم بارەوە سەیرن، بەڵام هاوڕێکانمان ئەو قسانەشیان بە سنگ فراوانی وەرگرت، هەندێکیان ئاماژەیان بەو ئایەتە دەکرد کە دەفەرموێت: دەشێت شتێکتان پێ ناخۆش بێت بەڵام خودا بەخێری بگێڕێتەوە بۆتان.

چەند کەناڵێکی تر هەبوو کە دەرگایان بۆ کردینەوە تاکوو بیروڕای خۆمان دەرببڕین، لەوانە کەناڵی فەیحای عەرەبی کە بانگهێشتیان کردین بۆ ئەوەی لە بابەتێکدا سەبارەت بە هەڵبژاردن قسە بکەین. ئێمەش بە سوپاسەوە بانگهێشتنەکەمان پەسەند کرد. ئەو چاوپێکەوتنەش بە گوێرەی ئەو قسانەی

پێمان گەیشتنەوە، سەرکەوتوو بوو. بەڵام ئەوەی دڵی خۆش کردم زیاتر کۆمێنتی پێشکەشکاری بەرنامەکە بوو کە گوتی: ئۆپۆزیسیۆن دەبێت وابێت!

ئینجا لەگەڵ کەناڵی حورپە چەند دیدارێکی ترمان سازکرد، ئەو دیدارانەش لە لایەن (سروە خان) بەڕێوە چوون. ئەو توانی ئەو بایکۆتە میدیاییەمان بە شێوەیەکی سنووردار لەسەر هەڵبگرێت کە بە هۆی کەشی نادیموکراتیی کوردستانەوە بەسەرماندا درابوو. کاندیدی سەرۆکایەتیش دکتۆر کەمال میراودەلی بە دەست هەمان دەردەوە دەیناڵاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا. لە راستیدا ئێمە سوپاسگوزار بووین بۆ ئەو بوارەی کەناڵی حورپەو بەشداریکردن لە خولقاندنی کەشێکی دیموکراتی لە هەڵبژاردندا. بەڵام ئەو دیدارانەش کاریگەرییان سنووردار بوون، چونکە بە زمانی عەرەبی بون لە کاتێکدا ئێمە دەبوو بە کوردی قسە بۆ خەڵك بکەین.

دوای ئەوەش لەگەڵ کەناڵی عیراقییە دیدارێکمان ساز کرد. لە راستیدا ئەوان گیانی دیموکراتییان زیاتر بوو لە کەناڵە کوردیەکان. ئەوانیش وەك دەنگی ئەمریکا رێگەیان بە هەموو قەوارە سیاسیەکان دەدا قسەی خۆیان بکەن.

لە راستیدا ئەو واقیعە نادیموکراسیەی هەرێم کۆسپێکی گەورە بوو لە بەردەممان کە نەمانتوانی دەنگی خۆمان بە خەڵك بگەیەنین. لە بەرامبەریشدا حزبە گەورەکان بەهۆی ئەوەی کەناڵەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو، لە کاتێکدا ئەو کەناڵانەی بە پارەی هەرێم بەڕێوە دەچوون. ئەوان بە ئارەزوی خۆیان شەو رۆژ ریکلامیان بۆ خۆیان دەکرد. لیستی کوردستانی کە هەردو حزبی دەسەڵاتداری پێکەوە کۆ کردبۆوە زۆرترین چانسی هەبوو، چونکە ئەوان بە درێژایی چەندین ساڵی دەسەڵات لە گەنجینەی هەرێم پارەیان کێشاوەتەوەو بۆ هەڵبژاردنەکان بەکاریان هێناوە و هیچ لایەنێکی تر سودی لەو پارەیە نەبینیوە. لەم بارەوە روداوێك دێتەوە یادم. سەرنوسەری رۆژنامەی ئاوێنە، پەیوەندیی بە کەناڵی گەلی کوردستانەوە کردبوو و پێی گوتبون ئایا دەتوانن دیدارێك لەگەڵ عەبدولموسەوور ساز بکەن؟ بەڵام ئەوان بەراشکاوی وەڵامیان دابۆوە: ناتوانین.

## میدیای رادیۆیی و هەڵمەتی هەڵبژاردن

میدیای رادیۆیی رۆڵی خۆی لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا هەیە، هەرچەند دوای دەرکەوتنی تەلەفزیۆن بایەخی رادیۆ کەم بۆتەوە. گۆبلز لە کاتی خۆیدا بەم شێوەیە باسی گرنگیی ریکلامی سیاسی کردووە کە وتویەتی "دەچینە هەموو ماڵێك". سەبارەت بە هەڵبژاردنەکانی هەرێم، ئەو میکانیزمەش دیسان لە ژێر دەستی حزبە گەورەکاندا بوو، هەر وەك کەناڵەکانی تیڤی و ئاسمانی و لۆکاڵیش، هەمووشیان خزمەتی ئەجێندای ئەو حزبە گەورانە دەکەن. بێگومان حزبە بچوکەکانیش بە هۆی ئەوەی هاوکاریی حزبە گەورەکان دەکەن، هەندێك دەزگای میدیاییان پێدراوەو رۆژنامەو گۆڤارو ئیستگەو تیڤییان هەیەو لەم دواییەدا کەناڵی ئاسمانیشیان دامەزراندوە، چونکە ئەوانیش هەندێك بەرماوەی حزبە گەورەکانیان بەرکەوتوەو لە بواری میدیادا بەگەڕیان خستوە. ئەو کارەی ئەوانیش جۆرێك زیرەکی و دووربینیی تێدایە.

سەبارەت بە لیستی ژمارە ٥٦ی "بزوتنەوەی چاکسازیی کوردستان" تەنانەت لەو ئامرازەش بێبەش کرابووین، چونکە ئەو توانایەمان نەبوو کە باسم کردن. بەڵام بەرێز هەڵۆ ئیبراهیم ئەحمەد دەرفەتی ئەوەی پێداین کەدوجار لە ئیستگەکەی ئەوانەوە (هانا) دیدار ساز بکەین. دیداری یەکەم لەگەڵ خۆم ساز کراو دواتریش رۆژنامەی "ئاوێنە" بڵاوی کردەوە، دوەمیشیان لەگەڵ دکتۆر ئیبراهیم خورشید ساز درا. سەبارەت بە رەوشی زانکۆکانی هەرێم. دکتۆر ئیبراهیم ئاماژەی بەوەدا کە دەتوانین سود لە ئیزگەی "نەوا" ببینین. ئەو پێشنیارەش دوای ئەوە هات کە دیدارێکمان ساز دا لەگەڵ خاتوو نۆدا بە زمانی کوردی. هەروەها لەگەڵ هاوکارمان (میدیا) دیدارێکیان سازدا، ئەم ئێستگەیە بوارێکی بۆ رەخساندین تا بتوانین رای خۆمان دەرببڕین، بوارەکەش لەگەڵ توانا ماددییە کەمەکانی ئێمەدا گونجاو بوو، هەروەها د. ئیبراهیم خورشید ناوبڕی بەرنامەکەی تەرخان کرد بۆ ئەوەی ریکلام بۆ لیستەکەمان بکات. ئەوەش بێگومان کارێکی سەرکەوتوو بوو. گومانی تێدا نیە کە ئەو ریکلامانە سودیان گەیاند بە لیستەکەمان.

هەروەها چەند دیدارێکمان لەگەڵ ئیستگەی سەوا ئەنجام دا بەڵام ئەویش بە زمانی عەرەبی بوو و لەوێدا هەندێك دەرفەتمان بۆ رەخسێنرا بۆ ئەوەی ریکلام بکەین بۆ لیستەکەمان. لەو دیدارانەش بە پلەی یەکەم مەبەستمان بوو دەنگمان بگاتە ناوچەی بادینان. بەڵام دوایی دەرکەوت کە پارتی دیموکراتی کوردستان لەوێ ئیستگەیەکی دامەزراندوە و رێك شەپۆلەکانی سەوای داپۆشیوە. تەنیا ناوچەی بەردەرەش بەرەو خۆرهەڵاتی نەبێت.

بەڵام باشترین دیدار کردبێتمان لەگەڵ ئیستگەی کوردینا بوو کە لە هۆڵەندەوە بەرنامەکانی پەخش دەکات بە زمانی کوردی و دیدارەکە دو کاتژمێری خایاند. ئەم دیدارە دەنگدانەوەیەکی زۆر باشی هەبوو، بەتایبەتی لە هەندەران، ئەوانەش کە بەرنامەکەیان پێشکەش دەکرد خۆشحاڵ بوون بە راشکاوییەکەم.

## ریکلامی هەڵبژاردن لە رێگەی ئینتەرنێتەوە

بڕیار وابو هەر لە سەرەتاوە پێگەیەکی ئەلیکترۆنیمان هەبێت بۆ ریکلام کردن و پەیوەندی بەستن لەگەڵ خەڵکدا، دو هاورێشمان لە هەولێر راسپێرا بوون بۆ ئەوەی پێگەیەك دابمەزرێنن. بەڵام هەڕەشەو چاو سورکردنەوەو ترساندن بە گوێ بڕین و لوتبڕین لە لایەن پارتیەوە ترسی خستە دڵی ئەوانەی بڕیار بوو ئەو کارە ئەنجام بدەن، بۆیە ئەوانیش پاشەکشەیان کردو دواتر نەمانتوانی ئەم کارە ئەنجام بدەین، بەڵام ئێمە ئێستاش هەوڵ دەدەین کارێکی وا بکەین چونکە کاریگەریی زۆری دەبێت و لە ڕووی مادیشەوە بۆ ئێمە گونجاوترە. لە لایەن دو پێگەی ئەلیکترۆنیەوە لە دەرەوەی وڵاتەوە لیستەکەی ئێمە پشتیوانیی لێکرا، ئەوە وێرای ئەوەی کوردستان پۆستیش هەندێك جار هەواڵەکانی سەبارەت بە ئێمەی پەخش دەکرد. هەروەها دیدارێکم لەگەڵ پێگەی (چاوی خەڵك) سازدا، ئەویش دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو. لە راستیدا گرنگیی ئەم ئامرازەش بە پلەی یەکەم دوای هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا، کە ئۆبامای تێدا سەرکەوت، دەرکەوت، دوای ئەوە ئیدی بوە میکانیزمێك کە

ناشێت فەرامۆش بکرێت، بەتایبەتی لە وڵاتانی پێشکەوتو. لە راستیدا تەلەفۆنیش هەندێك جار ئەو رۆڵە دەتوانێت ببینێت، ئەویش لە رێگەی ناردنی کورتە نامەوە.

## رۆژنامەو گۆڤارەکان

رۆژنامەوانی لە رابوردودا رۆڵی گەورەی گێراوە، بەلام لە ئێستادا ئەو رۆڵەی کەم بۆتەوە. هەرچەندە تائێستاش رۆڵی کارای هەیە وەك ئامرازێك بۆ ریکلام کردن. بەلای لیستەکەی ئێمەوە تەنیا رۆژنامەی ئازادو ئەهلی تاکە نەوامان بوون تاکوو بتوانین وەلامی ئەو درۆیانە بدەینەوە کە بەناومانەوە دەکران. بەتایبەتی لە لایەن زورناژەنەکانی مەسعودەوە، بێگومان هەموو ئەو رۆژنامانەش لە سلێمانی بوون، لەپێش هەموشیانەوە هاوولاتی، ئاوێنە، لڤین. بەراستی رۆژنامەنوسەکانی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە ئازایەتیەکی بێوێنەیان تێدا بوو شایستەی رێز لێنان بوون، بەڵکو هەندێکیان هەر کوژران یان هەڕەشەی کوشتنیان لەسەر بوو یان هەوڵی کوشتنیان درابوو چونکە وشەی راست هەمیشە دوژمنی زۆرە و دەیانەوێت بیخنکێنن پێش ئەوەی لە زار دەربچێت. وتەی راست وەك نورێك بە ناو تاریکیدا بڵاو دەبێتەوەو ئەوانەی فێری ژیانی تاریکی بون هەوڵدەدەن ئەو روناکیە بکوژێننەوە. ئەم ململانێ ئەبەدیە لە نێوان تاریکی و روناکییە هەزاران ساڵە بەردەوامیی هەیەو هەر دەشمێنێت.

من باوەڕی تەواوم هەیە بەوەی کە لە رێگەی سوربوونمان لەسەر بابەتیبوون و راستگۆییمان لە کردار و گوفتارماندا، توانیمان مەسعودو دەزگا میدیاییەکانی دەوروبەری بێدەنگ بکەین. بەتایبەتی چونکە ئێمە وەك خۆیان بە شێوەی پروپاگەندەی بێنرخ و بێبەهاو بێ ناوەڕۆك و ناشیرین تەنانەت لە شێوازی داڕشتنیشدا، وەلامان نەدانەوە، چونکە ئێمە ویستمان لە ناوەندی میدیاییشدا شۆڕشێکی باش بەرپا بکەین، کاتێك هەوڵماندا تەنیا راستیەکان بڵێین و لە چوارچێوەیەکی دیموکراتیدا بجولێینەوە، دور لە شێوازی سوك و

چرووك. ئێمە لە خوێندنەوەی مێژووەوە لەوە تێگەیشتوین کە هەمیشە ڕۆژنامەوانیی حزبی ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕاوە لە هەڵایسانی شەڕە ناوخۆییەکاندا. تەنانەت من پێشنیارم بۆ خوێندکارێکی ماجستێر کرد کە ئەو بابەتە بکاتە ماستەرنامەکەی، کەواتە بۆچی ئێمە جارێکی تر هەمان هەڵە دوبارە بکەینەوە، کە دەرکەوتوە ئەم کارە چ خراپ و مەترسیدارە؟ لێرەوە رامان وابوو کە زۆر جار بێدەنگی باشترە لە وەڵامدانەوە، وەك دەڵێن بێدەنگی لە ئاست کەسی بێعەقڵدا باشترین وەڵامە. ئەو تاوانەی ئەوان دژی ئێمە هەڵیان بەستبوو، ناچار بوون دروستی بکەن چونکە هیچی لە واقیعدا نەبوە، ئەگەر شتێکیش بوبێت ئەوە تۆمەتی خۆیان بوەو دەیانەوێت بە تۆپزی بیلکێنن بە ئێمەوە.

بێگومان ڕۆژنامەوانیش وەك هەر دەزگایەکی تری میدیا تا رادەیەکی زۆر وابەستە بوو بە هەژمووی حزبە گەورەکانەوە یان حزبە بچوکەکانی شوێنکەوتەی حزبە گەورەکانەوە. بێگومان ئەو واقیعەش کە لە ئێستادا کۆمەڵگەی کوردی تێدا دەژی لە دیموکراسیەتی راستەقینە دوری دەخاتەوە، چونکە پرەنسیپی هەلی یەکسانی لە کاتی هەڵبژاردن لە نێوان حزبە سیاسیەکان تێدا نیە.

## بڵاوکراوەکان

ئامرازێکی تری سەرەتایی هەیە کە هەندێك قەوارەی سیاسی لەبەر چەند هۆیەك پەنای بۆ دەبەن لەبەر نەبوونی پارەی پێویست بۆ گەیشتن بە دەزگای میدیایە کاراکانی تر، یان بە هۆی هەلومەرجی سیاسییەوە لە ژێر دەستی رژێمێکی سەرکوتکەردا، بۆیە لەسەر دیوارەکان دەنوسن وەك ئەوەی لە کاری نهێنیدا ئەنجام دراوە. ئێمەش لە لیستی چاکسازیی کوردستانیدا پەنامان بردە بەر ئەو شێوازە، ئەویش لەبەر هەر دوو هۆکارەکە، ئێمە هەڵساین بە چاپکردنی ١٥٠٠ نوسخەو لە هەر سێ شارەکەی کوردستاندا وەشاندمان.

## دیبەیتی سیاسیی راستەوخۆ

ئەمیشیان لە کۆنترین شێوازەکانی پڕوپاگەندەی سیاسیە و پێم وایە کاریگەرترینیانە چونکە دەنگدەر و کاندیدەکان بەرەو رووی یەکتر دەبنەوە و لەم حاڵەتەدا باشترین بۆچوون و باشترین پێشکەشکردن دەبیاتەوە. هەندێك جار پێکگەیشتنی راستەوخۆ لەگەڵ جەماوەر هەرزانترین جۆری پڕوپاگەندەیە، بەم جۆرە بە شێوەیەکی راستەوخۆ هەست و نەستی خەڵك ئاوێتەی کاندیدەکان دەبێ، بەڵام ئەو شێوازە لە وڵاتانی نادیموکراتیدا مەترسیی زۆری هەیەو لەوانەیە هەندێك جار هەلێکی باش بێت بۆ ئەوەی نەیارەکان هەلەکە بقۆزنەوەو لەناوت بەرن، هەردوو برای ئەمریکیش جۆن و رۆبێرت کیندی بەو شێوەیە کوژران.

ئێمە لە لیستی چاکسازی کوردستانیدا جەختمان لەسەر ئەم شێوازە دەکردەوەو پلانمان دارشت بۆ ئەوەی لە هەولێرو دهۆك ئەم کارە بکەین، بەڵام هەڕەشەی کوشتن کاندیدەکانی ترساند و رێگر بوو لە بەردەمماندا، بۆیە نەمانتوانی سود لەم چەکەش ببینین.

لە راستیدا ئەو هەموو پێشێلکاریەی دژی لیستەکەی ئێمە کرا لەو ماوەیەدا کاریگەریەکی خراپی هەبوو لەسەر دەروونی هەوادارانمان، پارتی دیموکراتی کوردستان لەم ماوەیەدا دو ڕوی هەبوو: یەکەمیان لەبەردەم چاوی کامێراکاندا بوو، لەوێدا باسی ئازادی هەڵبژاردن و دیموکراسیەت دەکرا، دوەمیشیان ئەوەبوو کە لە گۆڕەپانی سیاسیدا بەڕێوە دەچوو، کە بریتی بوو لە هەڕەشەی کوشتن و لوت وگوێ برین و فڕێدانە ناو روبارەوە... هتد.

ئەم رەوشە ناچاری کردین چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئێستگەی (کۆردینیا)ی هۆڵەندیدا ئەنجام بدەین و باسی ئەوە بکەین کە ئێمە بەرەو ڕوی حاڵەتی ترساندنی دەنگدەران بوینەتەوە ناچار بووین بە هەوادارانمان بڵێین کە ئاگایان لە خۆیان بێت لە هەر کارێکدا دەیکەن، بەڵکوو دەبێت وەك سەردەمی سەدام کاروباری سیاسی خۆیان ئەنجام بدەن.

## بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن

پرۆسەی هەڵبژاردن بەوە دەستی پێکرد کە پەیوەندیمان بە هاوڕێکانمانەوە کردەوەو داوامان لێ کردن ئەوانیش خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی لیستێکی کاندیدان پێك بێنین بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی داهاتوو، لە هەمان کاتیشدا ئامانجەکانمان بۆ ڕونکردنەوەو داوامان لێ کردن لەگەڵ ناسیاوو کەس و کارەکانیشیان لەو بارەوە قسە بکەن و پەیوەندی بە خەڵکەوە بکەن و داوای پشتیوانییان لێ بکەن.

پرۆسەکە بە گەشتی وەك ئەوە بوو کەسێك بەردێك فڕێ بداتە گۆمێکەوە، بەو هۆیەوە ئەڵقەکانی ئاوی ناو گۆمەکە بە هێواشی فراوان دەبن، چونکە لەو باوەڕەدا بووین کە تێزەکانی ئێمە لەگەڵ ڕەوتی مێژوو گونجاوە. لەو سۆنگەیەشەوە کە هەمیشە سیستمە دیموکراتییەکان لە سیستمە کۆنەکان بەبرەوترن، بۆیە پێمان وابوو ئێمە پێویستیەکی مێژوویی بەرجەستە دەکەین. لە ڕاستیشدا بەهەر کەسێك گەیشتبێتم و بابەتەکەم لەگەڵدا باسکردبێت هەرگیز ڕای پێچەوانەی نەبوە، چونکە پرسی ئێمە پرسێکی بابەتی و واقیعی بوو. لێرەوە دەمانبینی ژمارەی هاوکاران بەرەو هەڵکشان دەچوو تاکە کەسێك کە هەندێك تێبینی هەبوو لەسەر بابەتەکەمان کەسێك بوو بە هۆی پاڵنەری تاکەکەسی خۆیەوە تێبینی هەبوو دەیگوت: ناتوانم، چونکە ئەگەر وا بکەم بەڵێندەرایەتیەکەم دەفەوتێت، لەبەر ئەوەو لەبەر هیچی تر نا، ناتوانم.

ئەم ڕێوشوێنانەی گرتبومانە بەر هەر لە سەرەتاوە تەنیا تاقیکردنەوە بوون و هیچی تر، بەڵام بۆمان دەرکەوت لە ململانێی هەڵبژاردندا ئەگەری سەرکەوتنمان هەیە، وێڕای توانای داراییە کەمەکانیشمان. لە ڕاستیدا لە سیاسەتدا بیری دروست هەموو شتێکە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسانەی پێی هەڵدەستن ڕابوردویەکی پاکیان هەبێت، هەر ئەوە بەسە بۆ ئەوەی کۆسپەکان یەك دوای یەك بکەون ئەگەر هاتوو هەلومەرجی دیموکراتی ڕاستەقینە هەبێت.

یەکەم ڕاگەیاندنی ئاشکرای لیستەکەمان لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا بوو، دوای ئەوەی لە ٢٠٠٩/٣/٢٣دا لەگەڵ کاك نەشیروان قسەمان کرد. لەوێدا

ئامانجەکانی خۆمان روونکردنەوە و واقیعیانە قسەمان کردو ئامانجەکانمان دیاریکردو ئەگەرەکانیشمان بەرمەبنای بارودۆخ هەڵسەنگاند، ئامانجی ئێمە پێکهێنانی ئۆپۆزیسیۆنێکی پەرلەمانی بوو لە قۆناغی یەکەمدا، ئەوەش بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە قەیرانی دیموکراتیدا دروست بوە لە هەرێمی کوردستان. بەدەمەوە هاتنی خەڵکیش بۆ تێزەکانمان زۆر ئەرێنی و هەنگاوێکی گەورە بوو بەرەو پێش و رێخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی بتوانین چاوپێکەوتنی جەماوەری بە زوترین کات ئەنجام بدەین.

دوای چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنیەکە، مەسعود کە لە دەرەوەی وڵات بوو گەڕابوەوە، کاتێك من لە بارزان بووم، ناردبووی بە شوێن کەسێکدا کە لە هەردوکمانەوە نزیکەو داوای بینینی ئەو کەسەی کردبوو. لە رابردودا شتی وانەبوە، واتە بە پەلە داوا بکات ئەو کەسە ببینێت. ئەو کەسە نزیکە لێی پرسیم: ئەمە خووی مەسعود نیەو دەبێت شتێك قەوما بێت و پەیوەندیی بەتۆوە هەبێت. ئەگەر هەواڵی تۆی پرسی من لە جیاتی تۆ چیی پێ بڵێم؟ گوتم ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندیی بە هەڵبژاردنەوە هەبو، کە من پێشبینی دەکەم هەر ئەوە بێت، پێی بڵێ: ئیتر ئەوە هەڵمەتی هەڵبژاردنەو و حزبەکەی تۆ ناوی دیموکراتەو دەبێت بەپێی ناوەکەی خۆی هەڵسوکەوت بکات. پێی بڵێ تۆ توانای زۆرت لە زۆر بواردا هەیە و هیچ بەراوردێك لە نێوان تواناکانی ئەو و ئەواندا نیە، نە لە رووی داراییەوە نە لە رووی میدیاوە،ئەویش مافی خۆیەتی بە گوێرەی یاسا دابونەریتی دیموکراتیانە، سود لەو دەزگایانە ببینێت، دواجاریش ئەنجامەکەی دەزانین، هەر بۆ زانیاریشتان توانای ماددیی ئێمە پێنج سەد هەزار دینارە لە مانگێکدا، ئەویش لە موچەکەی خۆم دەبڕدێت.

هەر وایش بوو دوایی دەرکەوت هۆی چاوپێکەوتنەکە بەشداریکردنمان بوو لە هەڵبژاردندا بە لیستێکی سەربەخۆ. پاش پرسیارو وەڵامی درێژم کە بە پلەی یەکەم لەبارەی سەرچاوەی داراییمانەوە بوو بۆ بەشداری کردن لە هەڵبژاردن، چونکە ویستبووی بزانێت ئەو بڕە پارەیەی پێیانگوتوە دۆلارە یان دینار. کاتێك کە دڵنیا ببوو لەوەی کە بڕە پارەکە بە دیناری عیراقیە، گوتبوی: بەم

بڕه پارەیە ناتوانێت هیچ هەڵێکی سەرکەوتن بەدەست بێنێت، عەبدولموسەور بۆی هەیە بە لیستێکی سەربەخۆ دابەزێت وەك خەڵکی تر، ئینجا داوای ئەوەی کردبوو بارزان ناوچەیەکی جیاواز بێت لە ناوچەکانی تر، چونکە نامانەوێت لەوێ گرفت و کێشە سەر هەڵبدات. بەڕاستی من ترسم لەو هەڵوێستەی مەسعود هەبوو، چونکە هەمیشە ئەو شتێك دەڵێت و پێچەوانەکەی دەکات. ئەوەش ئەزموونی خۆمە لەگەڵیدا.

پاش ئەوەی لە بارزان دەرچووم و چووم بۆ دهۆك، لەوێ دەستم کرد بە پلاندانان بۆ ئەوەی کۆڕی جەماوەری بگرین و بیرو بۆچونەکانی خۆمان بۆ خەڵك بخەینە روو. ژمارەی هەوادارانمان زۆر بەرەو هەڵکشان بوو، بە شێوەیەك من خۆم پێشبینی شتی وام نەکردبوو، لەوێوە تێگەیشتین دیداری جەماوەریی روبەڕو باشترین کارە ئێمە بیکەین. لە وڵاتانی دیموکراتیشدا هەر ئەو مەنهەجە پەیڕەو دەکرێت. لەوێ جەماوەر مافی خۆیەتی هەر پرسیارێك بیەوێت بپرسێت.

لە سەرەتای مانگی چواردا گەڕامەوە بۆ بارزان و چەند رۆژێك لەوێ مامەوە بەڵام کاتێك لە ٢٠٠٩/٤/١٣ جێم هێشت و ویستم بچم بۆ دهۆك، مەسعود براکەی خۆی سیدادی ناردبوە سەرم بێ ئەوەی پێشوەختە هیچ ئاگادار کردنەوەیەکیان بۆ ناردبێتم و بێ هیچ پاساوێك و پێشەکیەکی بابەتی. ئەو هەڕەشەنامەیەکی بۆ ناردبووم دەڵێت: بە عەبدولموسەور بڵێن فەرمانمان بە هێزە چەکدارەکانی خۆمان و ئاسایش و هەواڵگری کردوە کە لە هەر شوێنێك عەبدولموسەوریان بینی دەستگیری بکەن و لێی بدەن یان بشیکوژن، ئەگەر گەڕایەوە بۆ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئێمە.

لە ٢٠٠٩/٤/١٤ دا کاتێك هەواڵەکەم پێگەیشت بەڕێوە بووم بەرەو سلێمانی. لە راستیشدا هیچ کەس باوەڕ بەم شتانە ناکات، بەڵام پێویستە باوەڕی پێ بکرێت لەبەر ئەوەی لە لایەن کەسێکی وەك مەسعودەوە دەرچوە. ئەو پیاوە کە بەردەوام پەیمان و بەڵێنەکانی خۆی دەشکێنێت. خۆ چەندین جار ئەم شتانەم تاقیکردۆتەوە، ئەم روداوە دڵنیای کردمەوە لەوەی کە هەر مەسعودیش بوە هەوڵی تیرۆر کردنی منی داوە، کاتێك لە مۆدلینك بووم. بەڵام ئەمجارەیان

بە ئاشکرای رووی راستەقینەی خۆی دەرخست، نەك وەك کەسێکی ترسنۆك لە پشت ناوی خەڵکانی ترەوە خۆی بشارێتەوەو دوایی بڵێت ئەو پەیوەندیی بەو کارەوە نەبوە.

کاتێك لە رێگە بووم بەرەو سلێمانی، پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم لە ئاسایشی دهۆکەوە پێگەیشت داوای دەکرد بڕۆم بۆ ئاسایش. کاتێك پێم گوت من لە سلێمانیم. چووبونە سەر ماڵەکەم بۆ ئەوەی خێزان و منداڵەکانم بترسێنن. ئەوەی سەیرە تێبینی دەکەین ئەم کارانە هەمووی کاری نایاساین ئەمە ئەو ئەقڵیەتە دەردەخات کە مەسعود هەیەتی، کاتێك وا هەست دەکات کە دەتوانێت تاوانێك ئەنجام بدات و خۆیشی لێ دەرباز بکات. لەو کاتەدا ئیدی هیچ دودڵ نابێت لە ئەنجامدانی هەر تاوانێك بێ ئەوەی ویژدانی ئازاری بدات یان هیچ حیسابێك بۆ یاسا بکات. لە کاتێکدا خۆی دەڵێت یاسا لەسەرو هەموانەوەیە.

ئەم رەفتارە لە راستیدا بە میرات بۆیان ماوەتەوە، ئەگەر سەیری کێشەی شێخ خورشید بارزانی بکەین کە دوای شێخی شەرعیی بارزانیەکان شێخایەتیی کردووە، دەبینین ئەویش لەو پیلانگێڕییانە بەدەر نەبوە، دوای شۆڕشی ١٤/ تەموزی/١٩٥٨ هەوڵی تیرۆر کردنی شێخ خورشید درا لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە. ئەوە لە کاتێکدا بوو شێخ خورشید لە دەشتی هەولێر دەژیا بە هۆی بڕیاری دورخستنەوەی بارزانیەکان لە ناوچەکانی خۆیان، پاش هەرەسهێنانی کۆماری مەهاباد. لەو کاتەدا شێخ خورشید لە لایەن مەلا مستەفاوە چەند جارێك هەوڵی تیرۆرکردنی درا لە کاتێکدا ئەو لە دەشتی هەولێر ئاوارە بوو بە هۆی بڕیارێکی سەردەمی پاشایەتیەوە دوای هەرەسی کۆماری مەهاباد.

ئەم بابەتە بۆ ماوەیەکی درێژ وەك نهێنیەکی شاراوەوە مابۆوە، تەنیا کەسانێکی کەم لە حزب پێیان دەزانی، بەڵام پاش ئەوەی کۆچی بەکۆمەڵ دەستی پێکرد، بە هۆی ئەو بارە نالەبارەی گەلی کورد بەسەریدا هاتبوو، لەوێوە ئیتر باسی تیرۆرو ماناکانی تیرۆر هاتە ئاراوە. لەو کاتەدا یەکێك لەوانەی بەشدار بوون لەو هەوڵە، ئەو بابەتەی کردەوە و باسی پیلانی کوشتنی شێخ

خورشیدی کرد گوتی: (ئێمەش تیرۆریست بووین، ئێمە فەرمانێکمان پێگەیشت بۆ ئەوەی شێخ خورشید بکوژین، بێ ئەوەی هیچ تاوانێکی کردبێت).

هۆکارەکانی شکستهێنانی ئەو پیلانە تا ئێستا نەزانراوە، بەڵام فەرمانی کوشتنەکە هەر مابوو، بەڵکو جێبەجێکردنەکەی دوا خرا بوو. دوای گەڕانەوەی شێخ خورشید بۆ ناوچەی بارزان، ئەو کەسەو هەندێك لە نزیکەکانی سەردانی شێخ ئەحمەد بارزانیان کردبوو، لێیان پرسیبوو چی بکەن، شێخ ئەحمەد پێی گوتبوون بچن بۆ گوندی شیری کە نزیك ناوچەی نزارەو بەرامبەر رێزانە لە کەناری ئەو بەری زێ. لەسەر فەرمانی شێخ ئەحمەد ئەو تاقمە چووبوونە ئەو دێیەو ئاوەدانیان کردەوەو و لە حەفتاکانی سەدەی رابوردو توانییان ئاودێری بۆ گوندەکە ئەنجام بدەن و دەشتی شیری بە ئامرازی سادە ئاوەدان بکەنەوە، ئەوەش دەستکەوتێکی گەورە بوو لە ناوچەکەدا.

لەو ماوەیەدا لە گوندی بارزان کۆبونەوەیەك کرا لە نێوان مەلا مستەفاو کۆمەڵێکی نزیك لە خۆی. لەو کۆبونەوەیەدا بڕیاری کوشتنی شێخ خورشیدیان دابوو. بەڵام دوان لە ئامادەبوان، ئەوانیش (ف. بارزانی) و(ح. بارزانی) بوون، بە پەلە شێخ ئەحمەد بارزانییان ئاگادار کردبۆوە لەو پیلانە. شێخ ئەحمەدیش نامەیەکی ئاراستەیەکی مەلا مستەفا کردبوو ئاگاداری کردبۆوە لەوەی کە هەڵەی وا نەکات. هەرچەند ناوەڕۆکی نامەکە تائێستا نەزانراوە بەڵام نامەکە هێند توند بوو کە بەس بوو بۆ ئەوەی مەلا مستەفا وا لێ بکات جارێکی تر بیر لە شتی وا نەکاتەوەو واز لەو پیلانگێڕیانە بێنێت و جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ کاری لەو شێوەیە.

سەبارەت بەو هەڕەشەیەی لە من کرابوو، دەبێت ئاماژە بەوە بدەم کە من مەسعودو نێچیرڤانم لە رێگەی شێخ سلێمانەوە ئاگادار کردبۆوە کە بە هیچ شێوەیەك هەڕەشەم لێ نەکەن، ئەگەر نا ئەوە بە تەواوەتی ریسوایان دەکەم. جا بۆ ئەوەی بەڵێنەکەی خۆم ببەمە سەر، بێ دوودڵی پیلانەکانیانم ئاشکرا کرد کە هەر خەریکی کوشتن و تۆقاندنی خەڵکن، ئەوەی سەیر بوو ئەوان بێ دوودڵی هەموو تۆمەتەکانیان لە خۆیان دورخستەوە، بێ ئەوەی شەرم لە خۆیان بکەن.

دواتر دەرکەوت کە عەبدولسەلامی برام بەردەوام ئەو هەڕەشانەی لەسەر بوە، دواجاریش پێش هەڕەشەکەی من بە ماوەیەك هەڕەشەیان لەوێش کردبوو.

لە سلێمانی دوای ئەوەی رای گشتیم لە کارەکەی ئەوان تێگەیاند، ئیدی بە شێوەیەکی ئاسایی گەڕامەوە سەر وانە وتنەوەکانی خۆم لە زانکۆ، وا رێکەوت پەرلەمانتارێکم لە ژوری راگری کۆلیژ بینی، لە کاتێکدا ئەو رۆژنامەی "هاولاتی"ی دەخوێندەوە. لەوێدا هەواڵی هەڕەشە لێکردنەکەی من بڵاو ببۆوە. ئەو خۆی سەر بە حزبەکەی مەسعود بوو گوتی: دکتۆر من لەو باوەڕەدا نیم مەسعود شتێکی لەو شێوەیە بکات. هەروەها گوتی: بەڵام چۆن دەبێت بە ئاشکرا بڵێت کە ناوچەی دەسەڵاتەکەی لە هەولێرو دهۆك تێپەڕ ناکات. ئەوە شتێکی سەیرە. منیش پێم گوت: دکتۆر هیوادارم ئەو پرسیارە لە مەسعود خۆی بکەیت، من ئامادە نیم لە بری ئەو وەڵام بدەمەوە، بەڵام ئایا پێت وانیە ئەو قسەیە لەگەڵ واقعی هەرێمدا یەك دەگرێتەوە؟

لێرەدا پێم باشە هەڵوەستەیەك بکەم لەسەر هەندێك دەستەواژەی وەك: دەستگیر کردن، لێدان، کوشتن. ئەم قسانە لە لایەن پەرلەمانتارێکیشەوە لە ماوەی رابوردودا کراوە. ئەو پیاوە خوشکێکی خۆی کوشت، بەو کارەشی لای مەسعود خۆشەویستتر بوو تا رادەیەك کردیە پەرلەمانتاریش. مەبەستم ئەدهەم عوسمانە. ئەوەش لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گۆڤاری "هۆنیا" قسەی کردبوو ئاماژەی بە من و بە ئەیوب بارزانیش کردبوو، بەڵام ناوی نەهێنابووین بەڵکو کارەکانی باس کردبووین. (بڕوانە گۆڤاری هۆنیا ژمارە ٢٣). بێگومان دوای ئەوەی ئەو قسانەم بینی کە بەوپەڕی بێئەدەبیەوە کرابوون (بانگەشەیەکی ئاشکرا بوون بۆ کوشتن) لە رێگەی رۆژنامەیەکەوە و لە لایەن پەرلەمانتارێکەوە! بۆیە ویستم لە سەر لاپەڕەکانی هەمان گۆڤار وەڵامی بدەمەوە، بەڵام عەبدولسەلامی برام هاتە ناو مەسەلەکەو نەیهێشت بڵاوی بکەمەوە. ئەو ئامۆژگاریی ئەوەی کردم کە سەرەتا لەگەڵ کاك رەبیع کوڕی شێخ محەمەد خالید بارزانی قسە بکەم لەو بارەوە. وەك هەنگاوی یەکەم. لە ماڵەکەی خۆم لە بارزان یەکترمان بینی. لەگەڵ کاك رەبیع لەو گۆشە نیگایەوە

قسەمان کرد کە ئەوان خزمایەتیان تازە کردبۆوەو وەك کورد دەڵێن چونکە کچەکەی دابوو بە ناوبراو. من ویستم تێی بگەیەنم کە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیم بەو کەسەوە نیەو لە داهاتوشدا نامەوێت پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبێت و هیچم لەگەڵیدا نیە، ئیتر بۆچی بەو شێوەیە رەفتار دەکات لەگەڵ من. هیوادارم تێی بگەیەنیت کە خۆی ماڵەکەی لە شوشەیەو منیش لەمەودوا ئامادە نیم لەو هەراسانکردنانەی ئەو بێدەنگ ببم. رەبیع تۆ هەڵسوکەوتی ئەو کەسە باش دەزانیت، هەر ئەو بوو رەفتاری زۆر ناشیرینی لەگەڵ باوکتدا نواند لە ئێران، تۆمەتی ناڕەوای بۆ دروستکرد. ئەو لەبەردەمی دەسەڵاتدارانی ئێران تاوانباری کرد بەوەی ماڵی خێزانە شەهیدەکانی خواردوە. بەڵام لێکۆڵینەوەکانی دەریانخست کە وانیە و ئەو کەسە خۆی دەستکاریی پارەی خێزانی شەهیدانی کردوە، بەو شێوەیەش سیحرەکە بەسەر ساحیرەکەدا شکایەوەو باوکت بێتاوان دەرچوو. لێرەدا عەبدولسەلام قسەکانی پێ بڕیم گوتی: من نازانم ئەو بەسەرهاتە بۆ کێ دەگێڕیتەوە، هەموو کەس ئەو قسەیە دەزانێت و رەبیعیش خۆی هەموو بەشەکانی رووداوەکە ئاگادارەو لە کاتی لێپێچینەوە لەگەڵ باوکیدا خۆی لەوێ بوو. من لە پاسەوانەکانی ماڵی شێخم بیستوە کە بەردەوام ئەو قسەیەی دوبارە دەکردەوە (هەر خودا خۆی دەزانێت من لە دونیادا هێندەی هاوکاری ئەو کوڕەم کردوە (واتە ئەدهەم) هاوکاری کەسی ترم هێندە نەکردوە. لە بەرامبەریشدا هیچ کەسێك هێندەی ئەو کوڕە ئازاری منی نەداوە هەموشی بێ هیچ پاساوێك).

راستە من بە قەد شێخ محەمەد خالید هاوکاریی ئەو کەسەم نەکردوە، بەڵام ئازاریشم پێنەگەیاندوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو داوای لێکردم نوسخەیەك لە تێزی دکتۆراکەمی بدەمێ. بۆ ئەوەی لای دەسەڵاتدارانی ئێران بە هۆی پەیوەندیی باشییەوە لەگەڵیاندا چاپی بکات. بەڵام کاتێك داوای نوسخەیەکی کتێبەکەم لێ کرد گوتی: لە رۆژنامەی حزبوڵڵای سەر بەخۆمان بڵاوم کردۆتەوە. گوتم: بە ناوی کێوە بڵاوت کردۆتەوە؟ بێ ئەوەی خۆی تێك بدات گوتی: بێگومان بە ناوی خۆمەوە. من نازانم ئایا راستی دەکرد یان نا؟ بەڵام لەو

ساتەوەختەوە تێگەیشتم کە دەبێت لەو کەسە وریا بم و کەم تێکەڵاوی بم. دوای ئەوە دەبینین هەڕەشەی کوشتن دەگۆڕێت بە شتی تری وەك تۆمەتی بەکرێگیراوی و کارکردن بۆ وڵاتانی دراوسێ. بەڵام ئێمە وەڵاممان دانەوە بەوەی کە ئەو جۆرە کارانە لە خۆیان دەوەشێتەوە نەك لە ئێمە، بە بەڵگەی ئەوەی کەئەوان بوون سەدامیان هێنایەوە بۆ هەولێر و هێزەکانی تورکیایان پەلکێش کرد بۆ ناو کوردستان و تائێستاش ئەو هێزانە ماونەتەوە.

جا لەبەر ئەوەی هیچ تاوانێکی راستەقینەیان دژی ئێمە بەدەستەوە نەبوو بەکاری بێنن، هەندێك کەس باسی خوێندنەکەی منیان کردبوە تۆمەتێك کە گوایە لەگەڵ داب و نەریتی بارزانییەکاندا یەکناگرێتەوە، ئەوەش ئەقڵیەتێکی تەواو دواکەوتوانەیە و بەدەستهێنانی بڕوانامەشم هەر لەسەر راسپاردەی باپیرم شێخی شەهید عەبدولسەلام بارزانی بوە، کە وەك زانراوە هانی بارزانیەکانی دەدا بۆ ئەوەی بخوێنن. هەر ئەویش یەکەم قوتابخانەی لە بارزان بنیاتناوە پێش جەنگی یەکەمی جیهان. ئەوەی لە نێو رۆژنامەکانی حزبدا بڵاو دەکرایەوە، لە راستیدا بەڵگەی مایە پووچی فیکری و ئەقڵیی پارتی بوو.

ئایا ئەوان ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزیان نەخوێندۆتەوە کە هانی خەڵك دەدا فێری خوێندن و خوێندنەوە بن، هەروەها چەندین فەرمودەی پێغەمبەری ئیسلامیش بە هەمان مانا هەیە.

## سیاسەتی دووبەرەکی نانەوە

سیاسەتی دوبەرەکی نانەوە لە لایەن گەلێك لە سیاسیەکانەوە پەیڕەو دەکرێت، لەوانە مەلا مستەفا و مەسعودی کوڕی، هەروەها سەدامیش لەو بارەوە زۆر لێهاتوو بوو. ئەم سیاسەتە بریتیە لە نانەوە و گەرمکردنی ئاژاوەو ململانێ لە نێوان خزماندا بە مەبەستی تێکشکاندنی ئیرادەی لایەنێکی ململانێکە، ملپێکەچکردنی لە بەردەم خۆیاندا لە ڕێگەی هەڕەشەکردن و هاندانی نەیارەکانیان دژیان ئەگەر بە جوانی گوێڕایەڵ نەبن. زۆر جاریش ئەو کەسەی گەمەکە دەکات خۆی لە پشت پەردەوە دەمێنێتەوە لە ململانێکاندا دەرناکەوێت و رای گشتی نایبینێت، سوێندیش دەخوات کە هیچ ئاگاداری ئەو ناکۆکیانە نیە. بەڵکو هەندێك جار وا خۆی دەردەخات کە ئەو هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکە بە شێوەیەکی ئاشتییانە دەدات. لە ئەزموونی کوردا دەبینین ئەم جەنگە، هاوتەریبە لەگەڵ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی نوسراو یان سەرزارەکی، دژی ئەو کەسە یان ئەو لایەنەی دەویسترێت چۆکی پێ دابدرێ لە بەردەمی دەسەڵاتدا. ئەو پڕۆپاگەندانە ناو و شۆرەتی ئەو کەسە ناشیرین دەکەن ئەگەر نهێنیەکی هەبوو، خۆ ئەگەر نهێنیەکی نەبوو ئەوە بۆی دادەتاشن.

لە ناوچەی بارزان مەلا مستەفا و مەسعودی کوڕی زۆر بە باشی سودیان لەم خووە بینیوە، لەوانەیە زەقترینیان بریتی بێت لە هاندانی هەردوو برا، شێخ محەمەد خالید و شێخ عوسمان دژ بە یەك لە نەوەدەکانی سەدەی پێشودا، کە خەریك بوو ببێتە هۆی نانەوەی شەڕێکی نێوخۆیی لە نێوان بارزانییەکان. ڕێسای ئەم گەمەیە ئەوەیە کە دەڵێت ئەوەی ناتوانیت سودی لێ ببینیت تێکی بشکێنە. من لەو باوەڕەشدا نیم کە کوژرانی سەدان بارزانی لە لای هەندێك کەس مانایەکی هەیە و وای کردووە هەست بە ئازاری ویژدان بکەن. کارەساتی بارزانییەکانی قوشتەپە راست و دروستیی ئەو قسەیەمان دەردەخات.

وێڕای ئەوەی نزیکترین کەسەکانی لەو کەسە هاندەدەن، فشاری زۆر بۆ خەڵکی تریش دێنن کە دەبێت پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەو کەسە بپچڕن، ئەویش لە ڕێگەی هەڕەشەکردن بە کوشتن، ئەگەر بەردەوام هاتوچۆی ئەو کەسە بکەن یان هاوکاریی بکەن. دەرەنجامی ئەو سیاسەتە کە هەندێك کەسی بێویژدان و بێ بەها لە ڕێگەی ململانێ و دابڕینی ئەو کەسە دەیانەوێت دەستیان بکەوێت، ئەوەیە ئەو کەسانەی تر چۆك دادەدەن لە بەردەمی ئەو کەسەی ئەم سیاسەتە پیادە دەکات، تا دەرونی ئەو کەسە تێکدەشکێنن و وای لێ دەکەن ئەویش ئامادە بێت هەمان گەمە دژی کەسانی تر ئەنجام بدات. واتە دەیکەنە چرنوکی پشیلە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە لەو کەسانە بێت کە بونەتە هۆی چۆکدادانی ئەم، یان لەوانەیە ئەوانیش قوربانیەکی تازە بن و بێتاوانیش بن و تەنیا تاوانیان ئەوە بێت کە خاوەن کەرامەتی خۆیانن و چۆك دانادەن بۆ کەسانێك هەر لە بنەڕەتدا شیاوی ئەوە نین گوێڕایەڵییان بکرێت.

دوبارەکردنەوەی ئەو سیاسەتە لە لایەن مەلا مستەفاو مەسعودی کوڕییەوە زۆرینەی بارزانییەکانی کردۆتە ئامرازێك بەدەستی خۆیانەوە. ئەوان بۆ هەڵسەنگاندنی هەر شتێك کە لە دەورو بەریان دەگوزەرێت، ناتوانن ژیرانە بیر بکەنەوەو ئەو شانۆگەرییەی سازی دەکەن، شانۆگەرییەکە هەم کۆمیدییە هەم تراژیدی. بارزانییەکان بەگشتی بونەتە دو بەش:

١-زۆرینەیەك کە لەگەڵ ئەو سیاسەتەدا دەڕوات و توانای گۆڕینی نیە و دەترسێت دواجار ئەویش ببێتە ئامانجێك بۆ ئەو سیاسەتە لە ئایندەدا، ئەگەر نا ئەوە بەشداری ناکات لە کاری ناشیرینکردنی خەڵکانی تر کە ئەم سیاسەتە لە دژیان پەیرەو دەکرێت.

٢-کەمینەیەك کە لەگەڵ دەرکەوتنی ئاماژەکانی ئەو گەمەیەدا دەبنە لایەندار و بەشداری دەکەن، هەوڵدەدەن ئەو کارەیان سەر بگرێت لە ڕێگەی بەشداریکردن و ڕۆڵ بینین بە شێوەیەکی خراپ بۆ ئەوەی گومان لەو کەسانە دور بخەنەوە کە لە بنەڕەتدا پیلاندارێژەری ئەو کارەن. هەمو ئەو کارەش بۆ دەستکەوتی ماددی دەکەن، جا زۆر بێت یان کەم یان بە هیوای دەستکەوتنی

پۆستێکن یان بۆ ئەوەی گومان لەسەر خۆیان لابەرن کە لە رابوردودا هەڵوێستێکی سیاسییان هەبوبێت دژی ئەو کەسانەی ئەم سیاسەتە دەکەن، دەیانەوێت تاوانەکانی پێشووی خۆیان بسڕنەوە.

لە راستیدا ئەم چەکە باشترین چەك بوە بەدەستیانەوە بۆ چۆك پێدادانی بەرهەڵستکارەکانیان و توانیویانە چۆك بە زۆریان دابدەن بە هەمو شێوەیەك. بەڵام لەگەڵ کەمینەکەیدا ئەو سیاسەتە شکستی هێناوە، ئەوانە زانیویانە چۆن ئەو گەمەیە بەڕێوە دەبەن و خۆیانی لەگەڵ دەگونجێنن یان بەرەو رووی دەبنەو و سیحرەکە بەسەر ساحیرەکەدا قڵپ دەکەنەوە، لەو کەسانەش شێخ سلێمان بارزانی لە یەکێتی سۆڤێت و جەلال تاڵەبانی لە عیراق.

شێخ سلێمان بارزانی لە سوڤێت توانیبووی رای زۆرینە بەلای خۆیدا رابکێشێت چونکە مەلا مستەفا نەیتوانی بوو ئەو دوبەرەکی نانەوەیە بەسەریدا فەرز بکات و کەسانێکی وای بەدەستەوە نەمابوو تاکوو بتوانێت بیکاتە داردەستی خۆی بۆ بەجێهێنانی ئەو پیلانە دژی شێخ سلێمان بارزانی. شەڕەکە لە نێوانیاندا هاوتا بوەو لە ئەنجامیشدا مەلا مستەفا شکستی هێناوە. سەبارەت بە جەلال تاڵەبانی دوای چەندین ساڵ لە شەڕی ناوخۆیی توانی ٥٠٪ بەسەر مەسعودا بسەپێنێت، مام جەلال بە هەمان سیاسەتی باوك و کوڕ بەرەنگاری سیاسەتەکانی ئەوان بۆوە بەتایبەتی لەبارەی وەرگرتنی کۆمەکی دەرەکیەوە، ئەگەر مەلا مستەفا کۆمەکی لە ئێرانەوە وەرگرتبێت، دەبینین مام جەلال رووی کردۆتە بەغدا بۆ وەرگرتنی کۆمەك. کاتێك مەسعود روویکردە سەدام بۆ بە هاناوە هاتن، دەبینین مام جەلال بێ دودڵی روی کردە تاران بۆ هەمان پشتیوانی و هەمان مەبەست و بۆ دروستکردنی جۆرێك هاوسەنگی، هەروەها بە هەمان شێوەی باوك و کوڕ پڕوپاگەندەی پێچەوانەی ئەوانی کرد تاکو نەتوانن بەتەواوەتی دایبڕن. لە راستیدا پشتبەستن بە کۆمەکی دەرەوە بنەمایەکی سەرەکی بوە بۆ زۆربەی بزوتنەوە کوردییەکان بەڵام شێخ عوسمان بارزانی نەیتوانی هەمان سیاسەتی مام جەلال بەڕێوە بەرێت.

وێرای ئەم حاڵەتە تایبەتانە، مەلا مستەفا و مەسعود توانیویانە ئەو چەکە زۆر بە باشی بەکار بێنن و ئەنجامی باشیشیان دەست بکەوێت. ئەم سیاسەتە دژی عوبەیدوڵلا و شێخ عوسمان و شێخ محەمەد خالید و کەسانی تریش زۆر بە باشی سەری گرت، ئێستاش دژی ئێمە بەکار دەهێنرێت، بەڵام تا ئێستا هیچ دەرەنجامێکیان نەبوە، ئێمەش رامانگەیاندوە کە بەرەنگاریی دەکەین و لەوەشدا رژدین. ئێمە باوەڕمان وایە دواجار سەر دەکەوین، چونکە پەندمان لە وانەکانی رابوردو وەرگرتوەو و ئاگادارین ئەو کارە چۆن دەکرێت، بۆیە دەڵێم هۆکارەکانی سەرکەوتن لای ئێمە هەیە و سەردەکەوین، بەتایبەتی ئەگەر بزانین شێوازی ئەو یارییە لە ئێستادا کەشفەو شاراوە نیە، بەڵکوو بۆتە کارێکی قێزەون و سوك. راستە تاکوو ئێستاش ترس بەسەر خەڵکیدا زاڵە بە هۆی هەڕەشەی دەرکردن لە ناوچەکە و لە کاریش، یان لە رێگەی گرفت دروستکردن بۆ خەڵك. سەبارەت بە جێبەجێکردنی ئەو پیلانە تێبینی دەکەین تا ئێستا دوو کەس ئامادەییان دەربڕیوە بەو کارە هەڵبستن، دەستیان کردوە بە بڵاو کردنەوەی تۆمەتی درۆ دژ بە ئێمە، بەڵام وەڵامەکانی ئێمە ئەوان و ئەوانەی پشت ئەوانیشی دەمکوت کردوە بە شێوەیەك تەواو سەغڵتمان کردون چونکە لە رابردوودا شتی وایان نەدیوە. شێوازی وەڵامدانەوەی ئێمە دوو بەش بووە:

یەکەمیان: وەڵامدانەوەی ئەوانەی خەڵەتێنراون و ئەوانەی لە گۆمی لێڵ راو دەکەن، جا بە پاڵنەری بچووك بێت یان بۆ پۆست و پارە. بۆ ئەوانە بە گوێرەی ئاستی خۆیان کات و توانایەکی کەممان تەرخان کردوە.

دوەمیان کە گەورەترینە، تەرخان کراوە بۆ ئەوانەی کە لە پشتیانەوەن چونکە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەرشانی ئەوانە، ئەوانیشمان بە تەواوەتی دەمکوت کردوە.

سەبارەت بە هاندانی ئەندامانی پاراستن بۆ ئەوەی پروپاگەندە لە رۆژنامەکاندا دژ بە ئێمە بڵاو بکەنەوە، ئەوەیان هیچ بایەخێکمان پێنەداوە، تاکوو بەرەی تر لە خۆمان نەکەینەوە.

ستراتیژی میدیاییمان وای دەخواست کە هەر لە سەرەتاوە راستیەکان بڵێین و ڕێ بدەین لایەنی بەرامبەر درۆ بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی خۆی دەربخات، ئەوەش وایکرد ئێمە متمانەیەکی گەورەمان بۆ دروست بێت و گومان لە قسەکانمان نەکرێت. برایەکی سوری لەم بارەوە گوتی: من بە پارتی دیموکراتی کوردستانم گوتوە کە بڵاو کردنەوەی درۆ زیان بە ئێوە دەگەیەنێت و لە قازانجی عەبدولموسەوردا دەبێت، ئەم هەڵمەتە رابگرن چونکە رای گشتی راستییەکان دەزانێت و خەڵك پشتگیریی عەبدولموسەور دەکەن و ئەو سودمەندی یەکەم دەبێت لەم حاڵەتەدا. یەکێك لەوانەی لە لەندەنەوە هاتبوو و لەگەڵ هەموو لایەنەکانیشدا دۆستایەتی باشی هەیە، لە سلێمانی پێی گوتم:

عەبدولموسەور ئەوان سەریان لێ تێکچوە نازانن چی بڵێن، چونکە مێژووی ئێوە پاکە و لەکەدار نیە، ئەوان لە گێژاوێکدان ناتوانن لێی دەرچن.

بۆ ئەوەی سیاسەتی ناشیرین کردن برەو پێ بدەن دەبینین مەسعود خۆی دەچێت بۆ بارزان بۆ پڕکردنی رای گشتی دژی ئێمە. دوای ئەوەی کە هەڕەشەی کوشتنی لێ کردین، ئەو سەردانی خێزانەکانی دەکرد و بە هەڕەشەو بەڵێنی چەور قسەی لەگەڵ دەکردن، هەڕەشەی دەرکردن یان بێبەشکردن لە هەر هاوکارییەکی ماددی، بۆ نمونە بۆ دروستکردنی خانوویەرە. لەبەرامبەریشدا پارەی دەبەخشیەوە بەسەر هەندێك ماڵی تردا بۆ ئەوەی رازییان بکات هەر وەك سەدام دەیکرد. بە هۆی ئەو واقیعە تۆقێنەرەوە زۆربەی خەڵك بێدەنگییان هەڵبژارد، ئەو کەمینەیەش کە هۆشیار بوون، مەسعودیان لە ئەنجامەکانی ئەو کارانەی دەیانکات ئاگادار دەکردەوە. هەروەك چۆن نوێنەرەکانی خۆی ناردبوو بۆ گوندەکان و ئاگاداری کردبونەوە لەوەی نابێت دەنگ بدەن بە لیستی چاکسازیی کوردستان، چونکە ئەگەر وا بکەن ئەوا لە ناوچەکە دەردەکرێن.

بەرمەبنای ئەو کاردانەوانەش کە لە گۆڤار و رۆژنامەکانیش رەنگی دابۆوە و هەواڵی هەڕەشەی کوشتنەکەیان لە دەرەوە و ناوەوەی هەرێم بڵاو کردبۆوە ، مەسعود و سیدادی برای لە هەڕەشەکەیان پاشگەز بونەوەو دەیانگوت ئێمە هەڕەشەی وامان نەکردوە. مەسعود چەند جارێك لە تەلەفزیۆن دەرکەوت و دەیگوت هەڵبژاردنەکان ئازاد و پاك و نهێنی و دیموکراتی دەبن. ئەمە لە

کاتێکدا لە بارزان هەڕەشەو ترساندنی خەڵك بەردەوام بوو، لەو کاتەدا پارەی باشیان بەسەر خێزانەکانی شەهیدانی قوشتەپەدا پەخشکرد بۆ ئەوەی خانوو بۆ خۆیان دروست بکەن، لە هەمان کاتیشدا هەڕەشەیان دەکرد لە هەر کەسێك دەنگ بدات بە لیستی چاکسازیی کوردستان. ئەم پێشڕەفتە سەرنجی زۆر کەسی بەلای خۆیدا راکێشابوو بۆ ئەوەی بزانن هۆکارەکەی چیە. دواجار بۆیان دەرکەوت مەسەلەکە لە ئۆپۆزیسیۆندایە، چونکە ئەوان پەردەیان لەسەر رووی پارتی هەڵماڵیوە.

بەڵام مەسعود و دەزگا هەواڵگرییەکەی بەمەوە رانەوەستان بەڵکوو ناوی هەوادارەکانی ئێمەیان دەستکەوتبوو، ئینجا لە رێگەی هەڕەشە و ترساندنەوە تەنگی پێ هەڵدەچنین و لە ئاسایشەوە بە شوێنیان دەناردن تا ناچاریان بکەن دەست هەڵبگرن لە لیستی ئێمە. لە رۆژی هەڵبژاردنیشدا بە روونی دەرکەوت کە رێگریان دەکرد لەوەی بارزانییەکان بە ئازادی دەنگ بدەن، چونکە لەگەڵ هەر کەسێکدا ئەندامێکی ئەو حزبە و دەزگای هەواڵگری دەچوون بۆ دەنگدانەکە و ناچاریان دەکرد دەنگ بە پارتی بدات. لە هاوینە هەواری سەلاحەدین و دیانا هەواڵمان پێگەیشت کە سندوقەکانی دەنگدان هەڵپچڕاون، هەمان شتیش لە ئاکرێ و زاخۆ روویاندا. ئەو شوێنانەش ئەوانە بوون کە ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد دەنگی باشیان تێدا بێنین. لەبەر ئەوە کاتێك رادیۆی سەوا پەیوەندییان پێوە کردین سەبارەت بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان، ئێمەش راستیی واقیعەکەمان پێ وتن و رامانگەیاند کە ئێمە ئامادە نین دان بەو هەڵبژاردنەدا بنێین هەرچیەك بێت.

لە راستیدا پیاو سەرسام دەبێت نازانێت مەسعود لە چی دەترسا. دواجار ئەو ترسە بوە زەنگێك هەر کە ئێمە باسی سیاسەتمان بکردبایە ئەو لێی دەدا. ئەندامێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەردانی کردم و سوێندی خوارد: ئەگەر تۆ نەبوویتایە هەرگیز مەسعود لەگەڵ مام جەلال رێك نەدەکەوت.

هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ئێمە بە پلەی یەکەم جەختی دەکردە سەر نەهێشتنی گەندەڵی ئیداریی بەربڵاو لە فەرمانگەکاندا، لێرەوە دەبێت بزانین ئەو کەسەی ماڵی خەڵك بدزێت بە ئاسانیش دەنگەکانیان دەدزێت.

وێرای هەموو ئەو شتانەی روویاندا، دواجار پێیان ڕاگەیاندین کە ئێمە وەك لیستی چاکسازی یەك کورسیی پەرلەمانمان بەدەستهێناوە. کاتێك هەواڵم دا بە عەبدولسەلامی برام، گوتی: ڕێگەیەك دەدۆزنەوە بۆ بێبەش کردنمان لەو کورسیەش. هەر واش بوو. هەرچەند ناڕەزاییمان دەربڕی لە دادگاکانی کوردستان سودی نەبوو.

## ئەو مەرجانەی دەبێت لە هەڵبژاردنی دیموکراتیدا هەبن

هەڵبژاردنی دیموکراتی کۆمەڵێك مەرجی هەیە نابێت دەستکاری بکرێت ئەگەر نا، ئەو هەڵبژاردنە متمانەی خۆی ون دەکات، ئەو خاڵانەش بە بڕوای من، ئەمانەن:

١-کاندید و دەنگدەریش دەبێت نهێنییان پارێزراو بێت و نابێت تەنگیان پێ هەڵبچنرێت، چونکە مەبەست لە هەڵبژاردن ئەوەیە بزانرێت گەل چیی دەوێت و ویستی گەل دەریکەوێت بێ هیچ دەستکارییەك. ئەو ئازادیە ئەوەش دەگرێتەوە کە دەبێت دەنگدەر بە ئازادی بچێت بۆ دەنگدان یان نەچێت، ئەگەر یاسایەك نەبێت پێچەوانەی ئەم خاڵە بێت. بەڵام ئەو پێشێلکاریانەی لە هەڵبژاردنی کوردستاندا روویاندا ئەو خاڵەیان بە تەواوەتی پێشێلکرد.لە بارزان هیچ ئازادیەك نەبوو و هیچ نهێنیەکیش نەبوو، تەنانەت هەندێك دەنگدەر باسی ئەوەیان دەکرد کە کاتێك دەنگدەرێك ویستویەتی بچێت بۆ دەنگدان، هەندێك ئەندامانی پارتی هاواریان لێ کردوەو پێیان گوتوە پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەیت، ئێمە لەبری تۆ دەنگمان داوە. مافی دەنگنەدانیش دیسان بە ئاشکرا پێشێل کرا. لە دوا هەڵبژاردنی ئەڵمانیا نزیکەی ١٨٠٠٠٠ دەنگدەری پارتی سۆسیالیستی ئەڵمانیا دەنگیان نەدا، ئەویش وەك ناڕەزایی دەربڕینێك دژی سیاسەتەکانی حزبەکەیان. بەمەش شکستی گەورەیان بەسەر حزبەکەدا هێنا. ئەو هەڵوێستەش وەك ئاگادار کردنەوەیەك بوو بۆ حزب تاکوو بگەڕێتەوە بۆ سەر ئایدیۆلۆژیای حزب خۆی ئەگەر نا، ئەوە ئەم جارەش هەمان شکست تووشی دەبێت. بەڵام هیچ یەکێك لە سەرکردایەتیی پارتی سۆسیالیستی

ئەڵمانیا ئەوەی بە بیردا نەهاتبوو بچێت کارتە بۆشەکانیان پڕ بکاتەوە. کەچی دەبینین پارتی هەر لە سەرەتاوە شانازی بەوە دەکات دەڵێت کارتە بۆشەکان دەنگی خۆمانن چونکە لە بەرژەوەندیی خۆمان بەکاریان دێنین. لێرەوە دەزانین کە هیچ سەیر نیە کاتێك هەر پێشێلکاریەکی تریش بکەن کە لە دواییدا باسی دەکەین. ئیدی ئازادیی ناڕەزایی دەربڕین لای ئەندامانی ئەم حزبە لە کوێ دایە.

٢-دەرفەتی یەکسان: دەبێت هەموو لیستەکانی هەڵبژاردن هەلی یەکسانیان بۆ بڕەخسێت تا بتوانن گوزارشت لە بیرو بۆچونەکانی خۆیان بکەن. بە پلەی یەکەم لە لایەن میدیاوە، هەروەها لە لایەنی دیشەوە تا رادەیەك دەبێت یەکسان بن. بەڵام ئەوەی لە هەرێم رو دەدات پێچەوانەی ئەم مەرجەیە، چونکە ئەو لایەنانەی لە قۆناغێکدا توانیویانە دەست بەرن بۆ خەزێنەی هەرێم، ئێستا ئیمتیازی زۆریان هەیە کە لیستەکانی تر هەرگیز خەونیشی پێوە نابینن. چ لە لایەنی راگەیاندنەوە بێت یان لە لایەنی ماددییەوە بێت یان لە رووی میدیاوە هەموویان کەناڵی ئاسمانی و لۆکاڵیشیان هەیە. ئەمە بێجگە لە کەناڵی رادیۆ کە هەمان مواسەفاتی هەیە، وێڕای گۆڤار و رۆژنامە و هتد... سەبارەت بەو لیستانەی نوێن وەك لیستەکەی ئێمە، نەماندەتوانی پەیوەندی بە جەماوەریشەوە بکەین، بەهۆی ئەو هەڕەشە بەردەوامانەی لەسەرمان بوون، لە لایەنی تەلەفزیۆنیشەوە هیچ دەرفەتێکمان نەدەدرایە، ئەگەر رۆژنامەی ئازاد نەبوایە هەر نەماندەتوانی قسەی خۆمان بکەین و رای خۆمان دەرببڕین و پڕۆپاگەندەی درۆش رەت بکەینەوە. لە هەولێر و سلێمانیش تابلۆکانی لیستە نوێیەکان دەدڕێنران. لە دهۆك هەر لە بنەڕەتەوە قەدەغە بوو هیچ شتێك هەڵواسیت، ئیدی هەلی یەکسانی لە کوێ بوو؟ ئەوەی سەیرە هەڵوێستی هەردو حزبی گەورە بوو بەرامبەر یەکتر لە هەڵبژاردنەکاندا، هەرچەندە بە یەك لیست چوبونە هەڵبژاردنەوە. لە کاتێکدا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان وێنەی کاندیدەکانی خۆی لە ناوچەی دەسەڵاتی خۆی هەڵدەواسی و وێنەی بەرهەم ساڵحی بۆ سەرەك وەزیران و مەسعودی بۆ سەرۆکی هەرێم هەڵدەواسی، کەچی پارتی رەتی کردەوە هیچ وێنەیەکی بەرهەم ساڵح هەڵواسرێت.

٣-ڕێگرتن لە بەخشینەوەی بەرتیل بۆ بەدەستهێنانی دەنگ: هەڵبژاردن مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە دەسەڵاتەوە هەیە بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ، بۆیە بەرتیل قەدەغەیە، لە فەرمودەیەکی پێغەمبەردا هاتوە (نەفرەتی خودا لە بەرتیل بەخش و بەرتیلخۆر). لێرەدا دەبێت دان بەوەدا بنێین کە بەرتیلدان لە هەمو وڵاتانی ئیسلامیدا. لە هەموو ئەو وڵاتانەی بەرتیلیان تێدایە سەرچاوەی داراییان بریتیە لە خەزێنەی دەوڵەت کە بە شێوەیەکی بەربڵاو بە خراپ سودی لێ وەردەگیرێت. لە هەڵبژاردنەکانی ٢٥/ ٧/ ٢٠٠٩ بەرتیل بەسەر خەڵکانێکی زۆردا پەخش دەکرا، بەتایبەتی لە دهۆك و ناوچەی سۆران بە مەبەستی هاندانیان بۆ دەنگدان بە پارتی. ئەو بەرتیلانەی دەدران هیچیان لە (١٠٠٠) دۆلار کەمتر نەبوون. لە هەندێك باردا بەرتیل دەگەیشتە پێشکەش کردنی ئۆتومبیلیش. ئەم هەموو پارەیە لە کوێوە دێت ئەگەر لە گەنجینەی حکومەتی هەرێم نەبێ؟

٤-یەکێ لە ڕێساکانی هەڵبژاردن ئەوەیە کە دەبێت کاتەکەی دیاریکراو بێت لە نێوان هەشتی بەیانیەوە بۆ شەشی ئێوارە. لە یەکەمدا، سندوقەکان دەکرێنەوە و لە دوەمیاندا دادەخرێن.بۆیە ئەم ماوەیە بە هیچ شێوەیەك نابێ درێژ بکرێتەوە. ئەو ماوە دیاریکراوە هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە هەڵبژاردنی تێدا ئەنجام دەدرێت، مەگەر لە بارێکدا نەبێ کە کات تیایدا جیاواز بێت بە شێوەیەك کە پێویست بێت ئەو جیاوازیە ڕەچاو بگیرێت. بۆ نموونە لە وڵاتێکی وەك ئەمریکا کە وڵاتێکی زۆر فرلوانە، کاتەکانی کردنەوە و داخستنی سندوقەکان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازن. بەڵام کاتژمێرەکان هەمووی وەك یەکن چ لە نیویۆرك بێت یان لە سیاتل.

سەبارەت بە هەرێمی کوردستان ئەم ریسایەش دیسان پێشێلکراوە، چونکە لە هەندێك شوێن کاتی دەنگدان درێژ کراوەتەوە. بۆ ئەوەی لەو کاتە درێژکراوەیەدا هەل بقۆزنەوە کارتە بۆشەکان لە بەرژەوەندیی خۆیان پڕ بکەنەوە. ئاشکرایە لەو ناوچانەدا لە کاتی درێژکراوەدا خەڵکێکی زۆر هاتوون بۆ دەنگدان، ئەگەر مەسەلە ساختەکاری نەبێت ئایا نابێت بپرسین ئەرێ ئەم دەنگدەرانە بە درێژایی ڕۆژ لە کوێ بوون؟

شایەنی باسە ئەو پێشێلکاریانەی لە هەڵبژاردنەکانی ٢٥/ ٧/ ٢٠٠٩ ئەنجام دراون زیاتر لە ٥٠٠ پێشێلکاری بوون. ئەوەش دەبێت بە جیدی بیری لێ بکرێتەوە. ئەو پێشێلکاریانەش لە لایەن زۆربەی رێکخراوە کوردی و دەرەکییەکانەوە تۆمار کراون.

لێرەدا دەبێت بپرسین: ئەگەر ولاتانی دیموکراتی ئاگایان لە ساختەکارییەکانە و لە پێش هەموشیان ئەمریکا، ئەدی بۆچی هیچیان نەوت؟ بە بڕوای من پاکی و بێگەردیی هەڵبژاردنەکان لە سلێمانی، هەڵوێستەکەی راستکردەوە، چونکە سلێمانی دەروازەی ئۆپۆزیسیۆن بوو بۆ پەرلەمان. ئەو هەنگاوەش لە راستیدا کەم نەبوو، بۆیە وەك هەنگاوێك لەسەر راستە رێگە هەژمار دەکرا. ئەوان هیوایان بەوە بوو کە ئەوە هەنگاوێك بێت بەرەوە دیموکراسی. بەهەر حاڵ دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان ئەو سیستەمەی تێکشکاند کە دەبوو هەموو شتێك نیوە بە نیوە لە نێوان هەردو حزب دابەش بکرێت. خەریك بوو دابەشکردنەکە دەگەیشتە لەسەدا سی. لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەدا ٤١ کورسیی پەرلەمان کەوتە دەست ئۆپۆزیسیۆن. هەرچەند پارتی توانی رێ لەوە بگرێت لیستەکەی ئێمە بچێتە پەرلەمانەوە، بەڵام ئەو کارەی ئێمە رێخۆشکەر بوو بۆ کەسانێکی تر ئامانجەکە بپێکن. کەسێك کە لە ئەڵمانیاوە هاتبوو گوتی: هەموو توانای خۆیان لەسەر ئێوە چڕ کردبۆوە ئەوەش رێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی خەڵکانی تر هەندێك دەستکەوت بە دەست بێنن.

هەبوونی ئۆپۆزیسیۆن لە ناو پەرلەمان دەتوانێت زۆر شت بگۆڕێت لە ماوەی ٤ ساڵدا، بە مەجێك ئەو ئۆپۆزیسیۆنە بتوانێ بە وورياييەوە کارەکانی ئەنجام بدات. گرنگترین کارەکانی ئۆپۆزیسیۆنیش، سەرپەرشتیکردنی بودجەو رێگرتنە لە گەندەڵی. دەتوانێت بەدواداچوون بکات بۆ ئەو پارانەی دەرکراون بۆ دەرەوەی ولات و ناوی ئەوانە بێنێ کە ئەو پارانە دەبەنە دەرەوەی ولات و بڕی ئەو پارانەی کە بەسەر بانکە جیهانیەکاندا لەهەموو کیشوەرەکانی دونیا دابەش کراوە.

## دیموکراسی پێداویستیەکی مێژوویە

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە لە هەر قۆناغێکدا سیستمە سیاسی و ئابوریەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتوە و هەموشیان لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگاکان هاوئاهەنگن، وەك ئەوەی سیاسەت و ئابوری رووی یەك دراو بن. لەم سەردەمەدا سیستمی ئابوریی سەرمایەداری دەستی باڵای هەیە و هەموو لایەنە ئابورییەکانی کۆنترۆڵ کردوە و لە راستیشدا لە گۆڕەپانی ئابوریدا رکابەرێکی تری نیە، بەتایبەتی پاش هەرەسی سیستمی سۆسیالیزم. ئەم سیستمە ئابوریەش رویەکی تری هەیە کە بریتیە لە سیستمی سیاسیی دیموکراتی. ئەو گەلانەی لەم راستیە تێگەیشتون و پراکتیزەیان کردوە، ئێستا لە هەموو کایەکانی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەوە لە پێشەوەن.

پاڵپشت بەم راستیە ئێستا ئەو وڵاتانە لە هەموو بەشەکانی تری دونیادا بونەتە قیبلەی ئەوانەی دەیانەوێت ژیانێکی کامەران بەدەست بێنن. ئەو کەسەش کە دەگاتە ئەوروپا وەك ئەوە وایە گەیشتبێتە کەناری ئارامی. جا بە هۆی راکردنەوە بێت لە قەیرانی ئابووری، یاخود لەبەر چەوسانەوەی سیاسی، ئایینی، نەتەوەیی... هتد ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو سیستمە شایەنی ئەوەیە لاسایی بکرێتەوە لە لایەن ئەو گەلانەی ویستی ئازادی و پێشکەوتنیان هەیە، چونکە ئەو سیستمە دەستەبەری ژیانێکی خۆشتر دەکات لە روی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە. بەم مانایە دەتوانین بڵێین دیموکراسی لەم قۆناغەی مێژوودا پێویستیەکی مێژووییە. کەواتە پەیڕەو کردنی ئەم سیستمە ئەرکی سەر شانەو دور کەوتنەوەش لێی هەڵەیەکی کوشندەیە.

ئێمە لە کوردستان لە هەموو گەلانی دونیا زیاتر پێویستمان بەم سیستمە هەیە، ئەوەش هەزاران هۆی هەیە، بەڵام لە هەموویان گرنگتر بۆ ئەوەیە کە دەربچین لەم گێژاوی ململانێ خوێناویانەی رودەدەن لە نێوان سەرکردەکانمان کە لەپێناوی دەسەڵاتدا پیادەی دەکەن و دواجاریش هەموو ئەو سەرکردانە

ڕەوایەتیی خۆیان لە توندوتیژی شۆڕشگێڕیەوە وەردەگرن. ئەوەش لە ڕێگەی بڵاو کردنەوەی ترس و تۆقاندن لە نێو خەڵکدا بە مەبەستی ملکەچکردن بۆ لایەنێکی دیاریکراو.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە بتوانین جەوهەری دیموکراسیی ڕاستەقینە وەك ئەوەی لە سیستمی دیموکراسیەتی سەردەمدا هەیە پەیڕەو بکەین، نەك تەنیا دەستگرتن بە هەندێك ڕواڵەتی تەفرەدەرەوە بۆ گێلکردنی گەلان، ئەم شێوازەش لە هەندێك وڵاتانی ئیسلامیدا پەیڕەو دەکرێت. ئێمە باوەڕی تەواومان بەوەیە ئەگەر نەتوانین لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا بڕۆین، هەمیشە دەبینە هۆکاری نەگبەتی و ماڵوێرانیی زیاتر بۆ کورد و کوردستان و کارەساتەکان دوبارە دەبنەوە وەك ئەوەی چەندین سەدەیە دەیبینین، ئەو ڕەوشەش پاڵنەرەکانی پەرتبوونی زیاتر و ململانێی خوێناوی دەسەڵات بەرهەم دێنێت. ئەو حاڵەتەش ناچارمان دەکات هەمیشە ببینە پاشکۆی هێزە دەرەکییەکان چونکە نەمانتوانیوە چارەسەری کێشەکانی خۆمان لە ناو خۆمان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بکەین.

لە هەستکردن بەم ڕاستیەوە بزوتنەوەی چاکسازیی کوردستانی هاتە بوون و لە پەیڕەوو پرۆگرامەکەیدا پێداگریی لەسەر ئەوە کرد کە گەندەڵی سیاسی دژ بە گەشەکردنی دیموکراسیە. پێم وایە گەندەڵیی سیاسی سەرچاوەی هەموو گەندەڵیەکانی ترە وەك گەندەڵی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ئیداری، چونکە گەندەڵیەکانی تر هەموویان زادەی ئەو گەندەڵیەی یەکەمن، چونکە سیاسیەکان هەوڵ دەدەن هەموو شتێك گەندەڵ بکەن لەپێناوی درێژەدان بە دەسەڵاتی خۆیان بۆ درێژترین ماوە، بۆ ئەوەی دواتر بۆ نەوەکانی خۆیان وەك میرات جێی بێڵن، ئەو ڕەوشەش لە جیهانی ئیسلامی و لە کوردستانیش لە ئارادایە. لە ڕاستیدا ئەستۆپاکیی سەرکردە سیاسیەکان بنەڕەتێکن بۆ پاکێتی لە کەرتەکانی تردا. بەپێچەوانەشەوە هەر گەندەڵیەك لە سەرکردایەتی سیاسیدا هۆکارێك دەبێت بۆ گەندەڵبوونی هەموو کایەکانی تری ژیان. لەبەر ئەوە پێویستە هەموو دامو دەزگاکان لە چوارچێوەی دیموکراسیەکی ڕاستەقینەدا

کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن و رازی نەبن بە رواڵەتی تەفردەرانەی دیموکراسی.

درێژەدان بە پەنابردن بۆ توندوتیژی و ساختەکاری بۆ گەیشتن بە ئامانجی ناڕەوا کە هیچ رەوایەتیەکی جەماوەریی لە پشتەوە نەبێت، دواجار سەردەکێشێت بۆ لێکترازانی رایەڵە کۆمەڵایەتیەکان. تا ئەو شێوازی سیاسەتەش بەردەوام بێت زیاتر لەگەڵ خولیاکانی جەماوەردا پێکدادەکێشێت و مەیلی توندوتیژی لای خەڵك زیاتر دەبێت. ئەم رەوشەش هۆکارێکی گرنگی هەڵایسانی شۆڕش و راپەرینەکانە. هەر کاتێك گەل پایە سەرەکییەکانی ئازادیی لە دەست دا بە هۆی چەوسانەوەی لە لایەن دەسەڵاتەوە، ئیدی ئەو جەماوەرە لادەدات و لە بەردەمی واقیعدا چۆك دادەدات، ئەگەر نەیتوانی بەرەنگاری ئەو دەسەڵاتە ببێتەوە. ئەو تەسلیم بوونەش چەندین شێوازی هەیە، وەك بەجێهێشتنی نیشتمان و دەربەدەری.

یان لەوانەیە هەندێك شێوازی تر وەربگرێت، وەك ئەوەی جەماوەر ئامادە بێت لەبەردەم هەر دەسەڵاتێکی تری بیانیش چۆك دادا بەو هیوایەی رزگاری بێت لە دەستی ئەم دەسەڵاتەی ئێستای، جا ناسنامەی ئەو هێزەی تر هەر چی بێت!

بەداخەوە زۆربەی سەرکردەکانی کورد، تەنیا لەبەر ئەوەی ماوەی دەسەڵاتی خۆیان درێژ بکەنەوە نایانەوێت پایەکانی دیموکراسی بەرقەرار بێت و لە دڵی گەلدا جێگیر بێت، بۆیە هەردەم هەوڵ دەدەن رۆڵەکانی گەل فێری ملکەچی و گوێڕایەڵی بکەن، ئەوەش وا دەکات هەر ئارەزوویەك بۆ سەربەخۆیی لە روحیاندا بکوژێ بەڵکوو تەنانەت شانازییان بە پەیوەستەگی نەتەوایەتیش دەکوژرێت، ئەو حاڵەتەش سەرەتایەکە بۆ ئەوەی بە ئاسانی لەبەردەم دەسەڵاتی خەڵکانی تریش چۆك دابدات.

بێگومان هەمیشە ئەو پرسیارە بەردەوام دەبیستین سەبارەت بەوەی کێ بەرپرسیارە لەم رەوشە؟ ئایا خۆسەپاندنی دەسەڵاتداران بە هۆی توندوتیژی و سەرشێواندنی جەماوەرەوەیە یان فەرامۆشی و بێئاگایی جەماوەر و بێدەنگ

بوونی له ئاستی ئەو ستەمەی لێی دەکرێت و بێ ئەوەی هیچ بەرگری له مافەکانی خۆی بکات، له کاتێکدا ئەو مافانە خەڵاتی خودان بۆ مرۆڤ و مرۆڤ بۆی نیە دەست لەو مافانەی خۆی هەڵبگرێت، بۆیە یاخیبوون له دەسەڵات کارێکی رەوایە ئەگەر هاتوو ئەو مافانەی پێشێل کران، جا ئایا هێلکە له مریشکە یان بە پێچەوانەوە؟

من زیاتر بەلای ئاراستەی یەکەمدا دەکەوم. دەڵێم بەپرسیارێتی گەورە دەکەوێتە سەرشانی فەرمانڕەوایان و سیاسیەکان چونکە دەبێت ئەوان دوربینتر و رۆشنبیرتر بن له جەماوەر و دەبێت واز بێنن لەوەی بەرژەوەندیی تاکەکەسیی خۆیان پێش بەرژەوەندیی گشتی بخەن، چونکە بەرپرسیارێتی پێش هەمو شتێك خزمەتکاریە بۆ خەڵك، نەك ئامرازێك بێت بۆ خراپ سودوەرگرتن و گەیشتن بە ئامانجی تاکەکەسی. بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت بەرپرسیارێتی بۆ خزمەتکردنی ئامانجە باڵاکانی بێت و دانەبەزێنرێتە ئاستی نزمی بەدیهێنانی بەرژەوەندیە تاکەکەسیەکان. هەرچەند من لەگەڵ ئەوەدا نیم جەماوەر بێتاوان بێت لەم بارەوە، چونکە جەماوەریش دەبێت هۆشیار بێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە رووی هەر کەسێکدا بوەستێتەوە کە دەیەوێت دەسەلات خراپ بەکار بێنێت.

مرۆڤ له ژینگەی دەوروبەری خۆیەوە فێری زۆر شت بووە، هەروەها له مرۆڤەکانی دەوروبەریشیەوە زۆر شت فێر دەبێت، ئەوەش سروشتی مرۆڤە،بەتایبەتی ئەگەر زانیمان پرۆسەی فێرکردن له هەمان کاتدا پرۆسەی فێربوونیشە. لەبەر ئەوە دەبێت جۆرێك پەیوەندی له نێوان سەرکردەو جەماوەردا هەبێت. دەبێت دواجار ئەو پەیوەندیەش ببێتە میکانیزمێك بۆ چارەسەر کردنی کێشە هەڵپەسێردراوەکان، بەڵام ئەوەش له کاتێکدا دەبێت کە بزانرێت بەرژەوەندیی گشتی ئامانجی باڵایە.

له سەرەتای مێژووی شارستانی مرۆڤایەتییەوە، ئەو شارستانێتییانەی دروست بوون و هەرەسیان هێناوە، هەموویان له یەکترەوە فێری شت بوون، لێرەوەیە دەڵێین گەلی کورد لەبەردەم گەلێك بژاردەو مەزهەبی کۆمەڵایەتی و

سیاسی و ئابووری پەروەردەیی دایە. ئایا ئەو گەلە دەیەوێت کامیان بکاتە ڕێنماییکەری خۆی؟ ئەمە پرسیارەکەیە. ئێمە لەو باوەڕەداین دەبێت گەلی کورد سەرکەوتوترین سیستمی فەرمانڕەوایی وەربگرێت، ئەویش دیموکراسیەتە. گەمژەییە سەرکردایەتیەك ڕژد بێت لەسەر چەسپاندنی سیستمێك لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا نەڕوات، لێرەوە دەبێت بزانین پرسی بنیاتنانی سیستمی دیموکراتی پێویستیەکی مێژووییە و لە ڕاستیشدا هیچ بەدیلێکی نیە، ئەمە ئەگەر ویستمان گەلەکەمان گەشاوەو سەرکەوتو بێت.

وەك هەستکردن بەم ڕاستیە، ئێمە لەو کەسانە بووین کە لە مێژە هاوار دەکەین بۆ ئەوەی ئەم سیستمە بنیات بنێین، هەرچەند دەشزانین سیستمی دیموکراسی بێ خەوش و کەموکورتی نیە، بەڵام ئەم سیستمە نزیکترینە لە بنیاتنانی دەوڵەتی یاساو دادپەروەری و گەشانەوە و گەشەی ئابوری و زانستی. وینستۆن چەرچەل سەرەك وەزیرانی بریتانیا لە کاتی جەنگی دوەمی جیهان باش ئەم ڕاستیە رون دەکاتەوە، کاتێك ئاماژەی بە زۆر لایەنی کورتهێنانی سیستمی دیموکراسی دەکا، بەڵام دواتر دەڵێت: بەڵام لەوە باشتریش دەست ناکەوێت! واقیعی ئێستای ئێمەش باشترین شاهیدە بۆ ئەم ڕاستیە، چونکە هەر بەراوردکاریەك لە نێوان دیموکراسیەت و هەر سیستمێکی تردا بێ سێ و دو دەریدەخات کە دیموکراسیەت باشترینە.

مرۆڤ زیرەکترین مەخلوقی سەرزەوییە. لە ڕاستیدا ئەم زیرەکیەی مرۆڤ تا ئێستا بە تەواوەتی سنورەکانی نەزانراوە چ بە باری باشدا یان خراپدا. لە ڕاستیدا هەندێکیان هێند باڵا دەبن کە ئەقڵ پەی پێنابات، لە بەرامبەریشدا هەندێك هێند ڕۆدەچن بە ناخی خراپەدا کە مرۆڤ دیسان ناتوانێت وێنای بکات. لەبەر ئەوەی باسی سیاسەت دەکەین، دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەز دەکات دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆیدا بن، چونکە لەو ڕێیەوە دەتوانێت بەرژەوەندییەکانی خۆی بەدەست بێنێت، بەڵام لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی گشتی. لێرەوە سیستمی دیموکراسی دێت و دەیەوێت سنورێك بۆ ئەم سەرکێشیانەی مرۆڤ دابنێت، ئەویش لە ڕێگەی جیاکردنەوەی

دەسەڵاتەکانەوە: راپەڕاندن و یاسادانان و دادوەری، هەروەها دەسەڵاتی چوارەمیش، واتە دەسەڵاتی راگەیاندن و رۆژنامەوانی. لێرەدا دەبێت باسی ئەوە بکەین کە پەرلەمان کار دەکا بۆ چاودێریکردنی کاروبارەکانی حکومەت. تاکوو بزانێت ئەو کارانەی حکومەت ئەنجامی دەدات تا چ رادەیەك دەستوریە یان نا، هەروەك چۆن دەبێت دەستور و یاسا لە بەرژەوەندی خەڵکدا بێت نەك لە خزمەتی کەسێك یان گروپێکدا بێت. ئینجا پرسی خولەکانی هەڵبژاردنەکان کە وەك دابونەریتی دیموکراسی ٤ساڵ جارێك ئەنجام دەدرێت. هەندێکی تریان بۆ هەر پۆستێك کاتێکی دیاریکراو دادەنێن و نابێت لەوە زیاتر هەڵبکشێت چونکە وەك دەڵێن (چەند ماوەی دەسەڵات زیاتر بێت زیاتر ئەگەری دیکتاتۆریەت هەیە و زیاتر لە دیموکراسی دور دەکەوینەوە).

بزوتنەوەی چاکسازیی کوردستان هەر لە سەرەتاوە بە راشکاوی دروشمی دیموکراسیەتی خۆراوایی بەرز کردۆتەوە بێ دودڵی، بە شێوەیەك کە لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردیدا بگونجێت. گرنگ ئەوەیە ئێمە بتوانین سود لە باشیەکانی ئەو سیستمە ببینین کە تا ئێستا بە تەواوەتی لەگەڵ رەوتی مێژوویی کۆمەڵگە پێشکەوتوەکاندا دەڕوا.

هەروەها بزوتنەوەکەمان ئەوەی خستۆتە روو کە ئامانجی ئەو لە بەشداریکردنی لە هەڵبژاردنەکاندا ئەوەیە کە وەك فراکسیۆنێکی ئۆپۆزیسیۆن بچێتە پەرلەمانەوە. داواشمان کرد یاسایەك دەربکرێت بۆ ئەوەی هیچ کەسێك بۆی نەبێت لە دو خولی هەڵبژاردن زیاتر لە دەسەڵات بێت بمێنێتەوە. بەڵکوو ئێمە پێمانوایە کە پۆستەکانی تریش لەگەڵ کورسیی سەرۆکایەتیدا هەمان یاسا بیانگرێتەوە. وەك سەرۆکایەتی پەرلەمان ، سەرۆکی وەزیران، پارێزگا، قائیمقام، بەڕێوەبەری ناحیەکان و شارەوانیەکان و دەبێت ئەو پۆستانەش دیسان لە رێگەی هەڵبژاردنەوە بن.

هەر بۆیە گەلێك لە کادرە ئەکادیمیەکان درکیان بەوە کردوە کە لیستەکەی ئێمە تاکە لیستێکە بتوانێت بانگەشەی نوێگەرایی بکات لەسەر هەموو ئاستێکی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی. بێگومان ئەوە بێجگە لەو کەسایەتیانەی

نوێنەرایەتی ئەم لیستە دەکەن، چونکە لە رابردودا لە روداوە خوێناویەکان و خراپەکاریەکان تێوە نەگلاون رابوردوی پاکیش متمانەیەکە بۆ ئایندە.

جا لەبەر ئەوە بزوتنەوەکەمان پێداگریی لەسەر لایەنی سیاسی کرد کە رەوا نیە تەنانەت سەرۆکی لیستەکەش لە دو جار زیاتر خۆی بپاڵێوێت، چونکە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی حزب وەك ئاوێنەیەك وایە رەنگدانەوەی هەیە بۆ دەرەوەش و دواجاریش دەبێتە میکانیزمێك بۆ کاروباری وڵات. دەبێت لە سەرەتاوە لە ناو رێکخستنەکانی خۆتەوە دەست پێ بکەیت تاکوو بیسەلمێنێت کە پابەندی بە پرەنسیپەکانی دیموکراسیەتەوە، ئەگەر دەسەڵاتداریش بێت. بە راشکاویش دەڵێین ئەو حزبانەی ئێستا لە کوردستاندان زیاتر لە مافیا دەچن نەك حزبێکی سیاسی و رێکخستنی سیاسی دیموکراتی راستەقینە. هەر ئەو واقیعە سەلبیەش وایکردوە ئەوانەی دەسەڵات بەدەستن تەماحی ئەوە بیانگرێت کە دەسەڵات بە میرات بۆ منداڵەکانیان جی بێڵن.

ئەوەش راستە کە دەوترێت ئەو ماوە درێژەی سەدام لە دەسەڵاتدا بوو، خەڵکی فێرکردوە و شێوازەکانی دەسەڵات بەڕێوەبردنی ئەو گوازراوەتەوە بۆ هەموو ئەوانەی لە کایەی سیاسەتدا لە عیراق کاردەکەن. تەنانەت هەندێك دەڵێن (هەر یەکێك لە ئێمە شتۆکەیەکی لە سەدامی تێدایە).

ئەگەر کۆمەڵگەی کوردی بیەوێت بمێنێ و گەشە بکات، دەبێت دیموکراسیەت بکاتە پەیڕەوی خۆی. یەکەمجار دەبێت لە حزبەکانەوە دەست پێ بکەن، دوایی لە پەیوەندی نێوان حزبەکانەوە، بۆ ئەوەی دواجاریش بتوانین لە ناو دام دەزگاکانی حکومەتدا پیادەی بکات. بە پێچەوانەوە ئەگەر وا نەبێت، دەبێت کۆمەڵگەی کوردی هەر وەك پاشکۆ بمێنێتەوە.

کۆمەڵگە ئیسلامیەکان بە گشتی فێری ئەوە بوون کە کاتێك شیکاری مێژوو دەکەن، تەنیا لایەنە گەشاوەکانی ئەو مێژوە باس بکەن و ناشیرینیەکانی دەشارنەوە، ئێستا حزبە سیاسیەکانیش هەمان شت لەگەڵ مێژووی خۆیان دەکەن. مێژوی هەمویان بەلای خۆیانەوە سپی و درەوشاوەیە و هیچ خلتەیەکی تیدا نیە. ئەگەر ئەو مێژووە هێند پاکە، ئەی ئەم هەمو دواکەوتوییە لە کوێوە هاتوە؟!

له راستیدا شیکاری زانستی و خوێندنەوەی لۆژیکیانە بۆ رووداو و پێشهاتەکان، وا دەخوازێت کە خاڵە خراپ و باشەکانیش پێکەوە بخوێنینەوە لە کاتی هەڵسەنگاندندا تەنیا باسکردنی خاڵە باشەکان دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی دەسەلات مێژوو بکاتە ئامرازێك بۆ گەمژەکردنی خەڵك و بیکاتە بەربەست لە بەردەم ئازادبونی گەل. هەموو رژێمێك چەند خراپ بێت، بەلام کەم تا زۆر هەندێ شتی باشی تێدایە، تەنانەت ئەڵمانیای سەردەمی هتلەرو یەکێتیی سۆڤێتی سەردەمی ستالینیش.

# پێرست